

کەمال سەعدی

# بیرەوەریی جەنگاوەرێک

ڕۆمان



هەولێر ٢٠١٨

| | |
|---|---|
| ناوی کتێب | : بیرەوەریی جەنگاوەرێك |
| بابەت | : ڕۆمان |
| نووسەر | : کەمال سەعدی |
| پیتچنین و هەڵەچن | : نووسەر |
| نەخشەسازی ناوەڕۆك | : ئاسیا سەباح |
| نەخشەسازی بەرگ | : ئامانج ئەمین |
| تیراژ | : ٥٠٠ دانە |
| چاپ | : چاپی یەکەم - چاپخانەی ڕۆشنبیری- هەولێر/ ٢٠١٨ |
| نرخ | : ٣٠٠٠ دینار |

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان
ژمارەی سپاردن، (٢٤٥)ی ساڵی (٢٠١٨)ی پێدراوە

هەولێر - گەڕەکی ڕاستی/ نزیك گەراجی بەغدا [illegible] بەلاوزن [illegible]

# مەشق و ڕاهێنان

بەیانــی زوو، لەخــەو هەســتام، چوومــە گەرماوەکــە، سەروڕیشــم تاشــی و دووشــێکم وەرگــرت. هەتــا لــە گەرماوەکــە هاتمــە دەرەوە، چایەکــەی لەســەر ئاگرێکــی کــز لــە دێــم دانابــوو، خوانەکەشــی وەکــو خوانــی شــاهانە بــە ژاژی و پەنیــری کــوردی ڕازاندبــۆوە.
جلوبەرگــم لەبەرکــرد، دەســتێک پێجامــە و تاقــم تەراشــم لەگــەڵ ڕۆمانــی (دایــک) ی مەکســیم گۆرکــی خســتە نــاو جانتاکەمــەوە.
ئینجــا چوومــە ســەر خوانەکــەو نانێکــی تیریــی گەرمــم بــە ژاژی و پەنیرەکــە خــوارد، دوایــی جانتاکەمــم بــە شــانمەوە کــرد، باوەشــم بــە دایکمــەوە کــردو هــەردوو دەســتەکانیم ماچکــرد.
ئەویــش نیوچەوانــی ماچکــردم، چەنــد دڵۆپێــک فرمێســکی گــەش لــە چــاوە گەشــەکانی تکانــە ســەر ڕوومەتەکانــم، بــە دەنگێکــی نــزم و لەبەرخۆیــەوە ئایەتــی کورســی قورئانــی پیــرۆزی لەژێــر گوێچکەکانــم خوێنــد، ئینجــا هــەردوو دەســتەکانی بــۆ ئاســمان بــەرز کــردەوەو بــە دەنگێکــی بــەرز لــە خــوا پاڕایــەوە وتــی:
خــودای گــەورە، منداڵەکــەم دەســت و پــێ ســپییەو لەهیــچ نازانــێ، ئەمانەتــی تــۆی دەدەم، بیکــە خاتــری گەورەیــی خــۆت، بیپارێــزە.
ئەمــەی وت و هەتــا بــەردەرگا لەگەڵــم هــات، ماڵئاوایــی لێکــردم.
منیــش یاغــر یاغــر بــەرەو شــەقامە ســەرەکییەکەی گەڕەکەکەمــان چــووم. بــەدەم ڕۆیشــتنەوە، نــاوە نــاوە ئاوڕێکــم لــە دەرگای ماڵەکەمــان دەدایــەوەو تەماشــایەکی ســیمای دایکمــم دەکــرد، فرمێســک لــە چاوەکانمــدا قەتیــس مابــوون، لــە خەفەتــی دوورکەوتنــەوە، قاچەکانــم زەوییــان نەدەگــرت. وامدەزانــی بــۆ زینــدان دەمبــەن، بــەڵام نەشمدەویســت لەبــەردەم دایکمــدا، وورەی خــۆم بڕووخێنــم، بۆیــە دانــم بەخۆمــدا گرتبــوو.

گەیشتمە شوێنی ڕاوەستانی پاسەکان، قارەمان قولی و قارەمان قشپل و زیاد مەندۆم لەوێ بینی، ئەوانیش چاوەڕێی هاتنی پاسەکەیان دەکرد. زیاد مەندۆ تازە یەکەم ساڵی دامەزراندنی بوو لە چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، دەچووە سەرکارەکەی، هەردوو قارەمانیش لەگەڵی ڕاوەستابوون، گاڵتەو گەپیان لەگەڵ دەکرد. کە لێیان نزیک بوومەوە، سڵاوم لێکردن.

زیاد مەندۆ ڕووی تێکردم و بەسەرسوڕمانەوە وتی: بۆ کوێ دەچی، ئەم جانتایەت بە شانتەوە کردووە؟

وتم: هاوڕێیان گەردەنم ئازادکەن، دەچمە خزمەتی سەربازی و لەوانەیە ماوەیەک نەتانبینمەوە.

کە ئەمەم وت، هەرسێکیان بەسەرسوڕمانەوە تەماشای یەکترییان کردو بەیەکەوە وتیان: دیسان شتێکت لەژێر سەردایە، زوو پێمان بڵێ و مەمانخەرە مەرەقەوە؟

لێیان نزیک بوومەوەو باوەشم پێیانکرد، وتم: بەخوا بەڕاستیمە، گاڵتەتان لەگەڵ ناکەم.

قارەمان قولی وتی: ئەم قسەیە لەکوێ هات، دوێنێ تاکو ئێوارە بەیەکەوە تۆپانێمان دەکرد، شتی وا لەگۆڕێ نەبوو، بۆچی لە کتوپڕێکدا ئەم سەفەرەت کەوتە پێش؟!

وتم هاوڕێیان وەڵامی ئەم پرسیارە، چیرۆکێکی درێژەو نامەوێ ئێستا سەرتانی پێ بێشێنم، ئەوەتا زیاد مەندۆ دەچێتە دەوام و منیش دەچمە دایەرەی تەجنید، وا پاسەکەش لێمان نزیک بۆتەوە. فریا ناکەوم بۆتان تەواوکەم، بەڵام بەڵێنتان پێدەدەم کە بە ئیجازە هاتمەوە، لە ئەلفەوە تاکو یا هەر هەمووی بۆتان دەگێڕمەوە.

پاسەکە گەیشتە لامان، جارێکی تر باوەشم پێداکردن و یەکتریمان ماچکردو من و زیاد مەندۆش سواری پاسەکە

بووین. جابییەکە بیتاقەکانی لە جانتاکەی دەرهێناو دوو بیتاقەی بۆ لێکردینەوە، دەستم بردەوە ناو باخەڵم و بیست فلسم دەرهێنا، ویستم بیدەمێ، بەڵام زیاد مەندۆ توند دەستی گرتم و نەیهێشت پارەکە بدەم، وتی: تۆ سەفەرێکی دووروودرێژت لە پێشە، تا ماوەیەک ناتبینمەوە، بۆیە من پارەکە دەدەم.

زیاد مەندۆ دڵی زۆر ناسک بوو، بە وشەیەک عادزدەبوو، بەڵام وێڕای ئەمەش دڵی زۆر ساف بوو، ئەگەر عادزیش با، زوو چاک دەبۆوە.

هەر لەناو پاسەکە وەستا عەلی بادوەییم بینی، ئەو ڕۆژە بێ ئیش بوو، بۆیە، بەو کاتە دەچووە چایخانەی وەستا عەلی.

چایخانەی وەستا عەلی لە نزیک قەڵاتی هەولێر بەرامبەر دەرگا گەورەکەی قەیسەری لە تەنیشت دەڵاڵخانەکە بوو. ئێواران زۆربەی وەستا و کرێکارەکانی شاری هەولێر وەکو نەریتێک دەچوونە ئەوێ. هەندێکیان تەختی دانیشتنیان بەردەکەوت و تا نزیکی نیوەڕۆ لێی دادەنیشتن و بەدەم چایە خواردنەوە یاری دۆمینەو دامەیان دەکردو ئەوانی تریش لەسەر قاچەکانیان لەبەردەرگای چایخانە ڕادەوەستان و چاویان دەبڕییە هەرکەسێک کە بەوێ تێدەپەڕی، بەهیوای ئەوەی کارێکیان دەستکەوێ.

ئەم فلیمە ئێوارانیش دووبارە دەبۆوەو وەستا و کرێکارەکان کە دەستیان لەکارەکانیان هەڵدەگرت، دەچوونە ئەوێ و تاکو ڕۆژئاوابوون لەوێ دەمانەوە.

وەستا عەلی ماڵی لە سەرەوەی ماڵی ئێمە بوو، هاوینان کە دەبووە پشووی قوتابخانە، من و برایەکەم لەلای ئەو ئیشی کەرپووچکێشان و قوڕکێشانمان دەکرد. برایەکەم خەوی لەمن سووکتر بوو، ئەو ڕۆژەی وەستا عەلی کاری هەبوایە، لەسەربانی خۆیانەوە، بە دەنگە گەورەکەی بانگی دەکردین

و دەیوت: (لەخەو هەستن ئەمڕۆ کارمان هەیە). وەکو وتم براکەم گوێیەکانی زۆر سووک بوو، دەتوت کەروێشکە، لەخەو ڕادەچڵەکی و بە چاوی خەوەوە، وەڵامی دەدایەوەو دەیوت: (وا هاتین وەستا عەلی).

وەستا عەلی کە جانتاکەی بە شانمەوە بینی، سەری سوڕما، بە سەرسوڕمانەوە وتی: ئەوە بۆ کوێ ئۆغر دەکەی، ئەم جانتایەت بە شانتەوە کردووە؟

منیش پێم وت: ناوی سەربازیم هاتووە، دەچمە دایەرەی تەجنید، بۆ بنکەی مەشق و ڕاهێنانی سەربازی ڕەوانەمان دەکەن.

وەستا عەلی وتی: ئەو سەربازییە لەکوێ پەیدابوو، ئەی تۆ قوتابی نیت؟

منیش وتم: وازم لە خوێندن هێناوە، بۆیە دەبێ سەربازی بکەم.

وەستا عەلی هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا وتی: ئەمانەتی خودابیت.

کە پاسەکە گەیشتە لای فلکەی زەعیم، زیاد مەندۆش دەستەکانی گوشیم وتی: منیش دەبێ لێرە دابەزم، لەگەڵ هاوڕێیەکم دەچینە سەر کارەکەمان.

زیاد مەندۆ لە پاسەکە هاتە خوارەوەو بۆ دواجار ماڵئاوایی لێکردم و تا پاسەکە لەبەرچاو ون بوو، لە شوێنی خۆی وەستابوو، بە دەستەکانی ماڵئاوایی لێدەکردم.

تا پاسەکە گەیشتە بەردەم بینایەی پارێزگا، لەمن زیاتر کەسی تری تێدا نەمابوو. منیش جانتاکەم بە شانمەوە کردو بەرەو دایەرەی تەجنید لە گەڕەکی تەیراوە ڕۆیشتم. بەدەم ڕێگاوە، دەیان بیرۆکەی ناخۆش بە خەیاڵمدا دەهات.

ژیانـی سـەربازی بۆمـن شـتێکی نـوێ بـوو، هەرچەنـدی دەمکـرد، پێشـبینی ئـەو ژیانـە نوێیـەم پێنەدەکـرا. ئـەوەی زیاتـر زاڵبـوو بەسـەر مێشـکمدا، دوورکەوتنـەوەم بـوو لـە خانـەوادە و دۆسـت و برادەرەکانـم، بەتایبەتـی زیـاد مەنـدۆ و سـابیر ڕەشـید.
کەوتبوومـە نـاو خەیاڵێکـی جەنجاڵـی دوورو درێـژەوەو هیـچ ئـاگام لـە دووری ڕێـگا نەمابـوو، بەخۆشـم نەمزانـی ئـەم ڕێـگا دوورەی نێـوان پارێـزگاو دایـەرەی تەجنیـدم چـۆن بـڕی. بـەدەم ڕێـگاوە بیـری ئـەم ڕۆژانـەم دەکـردەوە کـە لەگـەڵ سـابیر ڕەشـید لـە قوتابخانـە بوویـن و پۆلیسـە فەنـدی مامۆسـتای کۆمەڵایەتـی لـە ئامادەیـی کوردسـتان، هـەر ڕۆژەی پەنجـا فلسـی دەدا مـن یـان ئـەو. ئێمـەش یـان دوو لەفـەی گۆشـتمان پێـی دەکـڕی، یانیـش لەڕێـگای چوونەوەمـان بـۆ ماڵـەوە، دوونانـی گـەرم و کیلۆیـەک تەرۆزیمـان پێـی دەکـڕی و تـا دەگەیشـتینە ماڵـەوە، بـەدەم ڕێـگاوە بەیەکـەوە دەمانخـوارد.
هەندێـک جاریـش خەیاڵـم منیـان دەبـردەوە لای زیـاد مەنـدۆ. ئـەو ڕۆژانـەم بیردەکەوتـەوە، کـە ڕۆژانەکەمـان بـە یـەک چارەگ عـەرەق دەداو دەچووینـە لای فەیسـەڵ کـە پاسـەوانی بیـری ئیرتـوازی گەڕەکەکەمـان بـوو، دەمانداـیـە ئـەو، ئەویـش کـە سـەرخۆش دەبـوو، تـا نیـوەی شـەو گۆرانـی بـۆ دەوتیـن، ئێمـەش لەگـەڵ ئـەو سـەمامان دەکـردو چەقەنەمـان لێـدەدا. زۆر جارانیـش مـام ئەنـوەری چاپخانـە، ماڵـی لـە نزیـک بیرەکـە بـوو، بـە تووڕەیـی دەهاتـە دەرەوەو تـا دەگەیشـتە لامـان هـەر پرتـەو بۆڵـەی بـوو، دەیـوت: (وەختـە لەدەسـتی ئێـوە خانووەکـەم چۆڵبکـەم و سـەری خـۆم هەڵبگـرم. خەوتـان لـێ هەراسـان کردووینـە، دەنگتـان لەنـاو گوێچکەکانـم دەزرینگێتـەوە).
ئێمـەش هیـچ خۆمـان تێـک نـەدەدا، لەبـەری هەڵدەسـتاینەوەو

بەرێــزەوە پێشــوازیمان دەكــردو پێمــان دەوت: (مــام ئەنــوەر تــۆش لامــان دانیشــەو گــوێ لــە دەنگــە زولاڵەكــەی كاك فەیســەڵ بگــرە). كــە ئەمەمــان دەوت هێنــدەی تــر تورەدەبــوو، رووی لــە فەیســەڵ دەكــردو دەیــوت ( ئەوانــە گەنجــن لێیــان ناگیــرێ، بــەلام تــۆ دەڵێــی كــەری نــاو گارانــی، شــەرم لەخــۆت ناكەیتــەوە، ئــەم قورزەڵقورتــە دەخۆیتــەوەو وەكــو گا دەبۆرێنیــت؟!).
فەیســەڵیش هــەر لەگــەڵ یەكــەم پێــك ســەرخۆش دەبــوو، فــڕی بەســەر دونیــاوە نەدەمــاو دەكەوتــە جیهانێكــی تــرەوە. وایدەزانــی مــام ئەنوەریــش پێــی سەرسامە، بۆیــە هاتۆتــە ئــەوێ. بۆیــە زیاتــر دەنگــی هەڵدەبــڕی و تەبەقەكانــی دەنگــی بــەرز دەكردنــەوە. مــام ئەنوەریــش گوێچكەكانــی خــۆی دەگــرت و بــەرەو ماڵــی خۆیــان دەگەڕایــەوە.
تــا گەیشــتمە دایــەرەی تەجنیــد، دەیــان بیرەوەریــی خۆشــم بەبیــر دەهاتــەوە. دایــەرەی تەجنیــد لــە گەڕەكــی تەیــراوە لەســەر شــەقامی ســی مەتــری بــوو. بالاخانەیەكــی دووقــات بــوو، لەژێــرەوەی چەنــد دوكانێــك و كاســبكارێكی لێبــوو، لــە نهۆمــی ســەرەوەش دایــەرەی تەجنیــدی لێبــوو. ســەدان كــەس لەبــەردەم بالاخانەكــە كۆبووبوونــەوەو چاوەڕێــی خوێندنــەوەی ناوەكانیــان و وەرگرتنــەوەی دەفتــەر خدمەكانیــان دەكــرد.
عەریفێكــی ســێ خــەت لەســەرەوە لــە باڵكۆنەكــە ڕاوەســتابوو، لیستێكی گــەورەی بەدەستەوە بوو، لەگەڵ مایكرەفۆنێكی دەستی و بــە دەنگێكــی بــەرز ناوەكانــی دەخوێنــدەوەو هــەر لــە ســەرەوەش دەفتەرخدمەكانــی بــۆ ئامادەبــووان فرێدەدایــە خــوارەوە.
لەنــاو ئاپــۆرەی ئــەو خەڵكــەدا كەمێــك ڕاوەســتام و تەماشــایەكی ئــەو خەڵكەمكــرد، لــە یەكێكیــان نزیــك بومــەوەو پێــم وت:
تۆش ناوی سەربازیت هاتووە؟

وتی: بەڵێ.
وتم: وازت لەخوێندن هێناوە؟
وتـــی: نەخێـــر، خوێندنـــم تـــەواو کـــردووەو ئێســـتاش لەگـــەڵ لەدایکبووانـــی ســـاڵی پەنجـــاو هەشـــت دەمنێـــرن.
وتـم: منیـش وازم لـە خوێنـدن هێنـاوەو دەمـەوێ بچمـە سـەربازی. نازانـم لەکوێـوە دەسـت پێبکـەم و چیبکـەم؟
وتـــی: بچـــۆ لای دەرگا، نائیـــب عەریفێـــک لـــەوێ وەســـتاوە، ئـــەو دەفتـــەر خدمـــەکان کـــۆ دەکاتـــەوەو دەیانباتـــە ســـەرەوە، ئەگـــەر یەکێکیـــش بناســـیت باشـــترە ئیشـــەکەت بـــە خێرایـــی بـــۆ تـــەواو دەکـــەن و بـــۆ شـــوێنێکی نزیکیشـــت دەنێـــرن.
کـە وای وت، نائیـب زابـت ئەمجـەد و نائیـب عەریـف سـابیر مزووریـم بیرکەوتـەوە. هەردووکیـان خەڵکـی گەڕەکەکەمـان و هاوڕێـی خـۆم بـوون. چوومـە بـەر دەرگاکـەو بـە نائیـب عەریفەکـەی بـەردەرگام وت: دەمـەوێ بچمـە لای نائیـب زابـت ئەمجـەد و نائیـب عەریـف سـابیر مـزووری.
وتی: چی تۆنە، دەیانناسی؟
وتم: ئەوان هاوڕێی منن و خەڵکی یەک گەڕەکین.
کـە ئەمـەم وت، ڕێـگای دام بچمـە لایـان. بـە قادرمـەکان بەسـەرکەوتم و سـەرم بـەژوورەکان داگـرت، چـاوم بـە سـابیر مـزووری کـەوت، لـە ژوورێکـی بچکۆڵـەوە لەپشـت مێزێکـەوە دانیشـتبوو. کـە چـاوی بەمـن کـەوت، تووشـی شـۆک بـوو. لەبـەرم هەڵسـایەوەو وتـی: ئـەوە خێـرە ڕێـت کەوتۆتـە ئێـرە؟
وتـم: نازانـم خێـر دەبـێ یـان شـەڕ، بـە قاچەکانـی خـۆم هاتـووم دەمـەوێ بچمـە سـەربازی.
وتـــی: دانیشـــە، جـــارێ بـــا چایەکـــت بـــۆ بانـــگ بکـــەم، ئینجـــا تێمبگەیەنـــە بیرۆکـــەی ئـــەم چوونـــە ســـەربازییە لەکـــوێ هـــات؟

چایەچیەکـەی بانـگ کـردو چایەکـی شـیرینی بۆهێنـام. هـەر بـەدەم چایەخواردنـەوە پێـم وت: خـۆت دەزانـی مـن لەدایکبـووی ساڵی (١٩٥٦)م، بـەڵام لەگـەڵ لەدایکبووانـی سـاڵی خـۆم نەچومـە سـەربازی، چونکـە ئـەوکات بـەردەوام بـووم لـە خوێنـدن. بـەڵام ئێسـتا دوای ئـەوەی بـە بڕوانامـەی ناوەنـدی لـە ئەمینداریێتیـی شـارەوانی و هاوینەهـەوارەکان دامـەزرام، دوو سـاڵە لەسـەر یـەک لـە پۆلـی شەشـی ئامادەیـی ماومەتـەوە بەهـۆی دەوام نەکردنـم، بۆیـە دەبێـت خزمەتـی سـەربازیم تـەواو بکـەم کـە پێشـتر بەهـۆی خوێندنـەوە دواخرابـوو.

کـە ئەمـەم وت، هەناسـەیەکی قووڵـی هەڵکێشـاو وتـی: خۆزگـە دانەدەمەزرایـت و بـەردەوام دەبوویـت لـە خوێندنەکـەت، سـەیری حاڵـی ئێمـەت کـردووە، وەزعـی سـەگ خۆشـترە لـە هـی ئێمـە!!

بـەردەوام بـوو لـە قسـەکانیدا وتـی: تـۆ وادەزانـی سـەربازی هێنـدە خۆشـە، دەسـتت لـە خوێنـدن هەڵگرتـووەو دەتـەوێ بچیتـە سـەربازی؟

کـە وای وت، پێـم وت: تـازە کار لـەکار تـرازاوە، خـۆت دەزانـی زۆرم هـەژاری و نەداریـو بێپارەیـی بینیـوە، هاوینـان هیـلاک بـووم ئەوەنـدەی کەرپـووچ و قـوڕ بکێشـمەوە، وێـڕای پرتـەو بۆڵـەی وەسـتاکان، بۆیـە ناچاربـووم کـە واز لـە خوێندنـی بەیانیـان بێنـم و دابمەزرێـم. بـەو هۆیـەوەش نەمتوانـی خوێندنەکـەم تەواوبکـەم.

دەسـتی گرتـم، منـی بـردە ژوورێکـی تەنیشـت ژوورەکـەی خـۆی، پێـش ئـەوەی لـە دەرگا بچێتـە ژوورەوە وتـی: دەزانـی دەچینـە لای کـێ؟

وتم: نازانم.

وتـی: دەتبـەم بـۆلای کەسـێک ئیشـەکەی تـۆ لای ئـەوەو تـۆش دەیناسـیت، بـە چاوترووکانێـک بـۆت دەکات.

کـە وای وت، بیـرم بـۆ نائیـب زابـت ئەمجـەد چـوو، پێمـوت: نـاکات ئـەو کەسـەی دەچینـە لای نائیـب زابـت ئەمجـەدی هاوڕێـی خۆمـان بێـت؟!

بەپێکەنینـەوە وتـی: باشـت زانـی، بەڵـێ خۆیەتـی. ئـەو ئێسـتا لێـرە هەمـوو شـتێکە و بەقـەدەر بەڕێوەبـەری تەجنیـد دەسـتی دەڕوات.

سـابیر مـزووری بەپێشـم کـەوت و چـووە ژوورەوە. بـۆ ڕێزلێنانـی سـەربازیش قاچەکانـی بـە قایمـی لـە زەوی دا و پێـی وت: دەزانـی کێـم هێناوەتـە لات؟

بەبـی ئـەوەی چـاوی لەسـەر پەڕاوەکـەی بەردەمـی هەڵبگرێـت وتـی: کێیـە؟

نائیـب عەریـف سـابیر مـزووری ئیشـارەتی بـۆ مـن کـردو پێـی وت: تەماشـاکە بزانـە کـێ لەبەرامبـەرت ڕاوەسـتاوە؟

کـە ئەمـەی وت، نائیـب زابـت ئەمجـەد پەڕاوەکانـی خسـتە لایەکـی مێزەکـەو سـەری خـۆی هەڵبـڕی. کـە منـی بینـی لەشـوێنی خـۆی هەسـتایەوەو دەسـتی بـۆ درێـژ کـردم و تۆقـەی لەگـەڵ کـرم و وتـی: ئێـرە شـوێنێکی خۆشـنییە، خێـرە ڕێـت پێـی کەوتـووە؟

منیـش وتـم: ئەمـە چیرۆکێکـی درێـژە، نامـەوێ سـەرت پێـی قاڵبکـەم، دوایـی نائیـب عەریـف سـابیر بۆتـی دەگێڕێتـەوە.

کـە ئەمـەم وت، نائیـب عەریـف سـابیر دەفتـەر خدمەکەمـی خسـتە بەردەمـی و پێـی وت: ئـەو وەکـو ئێمـە نییـە، ناتوانـێ لـە هاوڕێکانـی دوور بکەوێتـەوە، بۆیـە لەشـوێنێکی نزیکـی دابنـێ، تاکـو بتوانـێ ڕۆژانـی پێنجشـەممە و جومعـە بەسـەردان بێتـەوە.

نائیـب زابـت ئەمجـەد لەنـاو چەکمەجەکـەی بەردەمـی، لیسـتێکی دەرهێنـا، نـاوی ئـەو شـوێنانەی تیابـوو کـە ئـەو کەسـانەیان بـۆی دەگوێزایـەوە. بەخێرایـی چـاوی پێـدا خشـاندو وتـی: نزیکتریـن

شوێن کە لە بەڕێوەبەرایەتی تەعبیئە و ئیحسا بۆمان هاتبێ، بنکەی مەشقکردنی سەربازی شاری کەرکوکە. هەندێک ساڵ خەڵکمان بۆ بنکەی مەشقکردنی سەربازی شاری هەولێریش دەنارد، بەڵام ئەمساڵ لەبەختی ئەو ئەم بنکەیەی تیا نییە.
نائیب عەریف سابیر وتی: ئەویش لەچاو بنکەی مەشقکردنی سەربازی ناوەڕاست و باشووری عێراق باشە، زۆر دوورنییە، دەتوانێ ڕۆژانی پێنجشەمووان دوای تەواوبوونی مەشق بگەڕێتەوە ناو خانەوادەکەی و چاویشی بە هاوڕێکانی بکەوێت.
ئیتر بەم شێوەیە، دەفتەر خدمەکەی بۆ پڕ کردمەوەو هەرخۆشی چەند ژوورێکی پێکردو نەگەڕایەوە لامان تا بۆی تەواو کردم و دایەوە دەستم و وتی: ئەو کەسانەی کە ئێمە دەیانناسین، هەر خۆشمان لەگەڵ فەرماندەی ئینزباتی سەربازی دەیاننێرین. بەڵام نامەوێ تۆ ڕادەستی ئەوان بکەم، چونکە تا دەتگەیەننە جێ، زۆر ماندووت دەکەن. بۆیە ئەم نووسراوەت ئەدەمێ، بەیانی زوو، کەلوپەلی پێویست بخە ناو جانتایەک و بڕۆ گەراج و بە نەفەرات بڕۆ شاری کەرکوک، لەوێش بە تەکسییەک بڕۆ بنکەی مەشقی سەربازی و ئەم نووسراوەیان بدێ. هیوادارم بەبێ گرفت سەربازییەکەت تەواوبکەیت.
نووسراوەکەم لێی وەرگرت و جانتایەکەم بەشانم وەکردو ماڵئاواییم لێیانکرد. گەراجی کەرکوک لەوێ نزیک بوو. بۆیە ملی ڕێگام گرتەبەر، بە شەقامی سی مەتری، یاغر یاغر بۆی شۆڕ بوومەوە.
گەیشتمە بەردەرگای گەراج، هەندێک کەسم بە جلوبەرگی سەربازییەوە بینی. لێیان نزیک بوومەوە، دوای سڵاوکردن، لێم پرسین: ناوی سەربازیم هاتووە، دەمەوێ بچمە بنکەی مەشقی سەربازی کەرکوک، زانیاریتان لەسەری هەیە؟

یەکێـک لـە سـەربازەکان وتـی: منیـش لـەو بنکەیـە سـەربازم، ئەمـڕۆ ئیجازەکـەم تـەواو دەبێـت، دەگەڕێمـەوە ئـەوێ.
کە ئەمەی وت زۆر دڵم خۆشبوو، لە دڵی خۆمدا وتم (ئەمەش هەرباشە، چاک نەبوو هاورێیەکم بۆ پەیدابوو).
ئیتر ئەوەبوو، بەیەکەوە بەرەو شوێنی ڕاوەستانی ئۆتۆمبێلەکانی کەرکوک ڕۆیشتین. شوفێرەکە، کە چاوی بەئێمە کەوت، بەرەو لای ئەو دەڕۆین، لە دوورەوە بەدەنگی بەرز وتی: تەنها دوو نەفەرمان ماوە.
من و ئەو سەربازەی لەگەڵم بوو، جانتاکانمان دایە دەست شوفێرەکە، خستییە ناو سندووقی ئۆتۆمبێلەکەی، ئێمەش لەگەڵ پیرەمێردێک لە کوشنی پشتەوە دانیشتین.
هەرچەند شاری کەرکوک لە هەولێرەوە زۆر دوور نییە، بەڵام یەک سایدی و خراپی ڕێگاکەی، وای کردبوو، ڕۆژانە ڕووداوی هاتوچۆی لێ ڕووبدات. هەر لەگەڵ لێدانی سلفی سەیارەکە، ئەو پیرەمێردەی لە تەنیشتمان دانیشتبوو، دەستی کرد بە خوێندنەوەی ئایەتی کورسی و دواییش ڕووی لە ئێمە کرد، وتی: خەڵکی شاری کەرکوکن؟ ئێمەش وەڵاممان دایەوە وتمان نەخێر. خەڵکی شاری هەولێرین، بۆ مەشق و ڕاهێنانی سەربازی دەچین.
کە ئەمەم وت، پیرەمێردەکە چاوەکانی پڕی ئاو بوون. ڕووی تێکردم و وتی: تاقە کوڕێکم هەبوو، ئەویش وەکو ئێوە ناوی سەربازی هاتووە، ماوەیەک لە شاری کەرکوک مەشق و ڕاهێنانیان پێی دەکرد، هەموو پێنجشەممان دوای مەشق و ڕاهێنان دەهاتەوە، بەڵام لە هەفتەی ڕابردووەوە نەگەڕاوەتەوە، دەڵێن گواستوویانەتەوە بۆ باشووری عێراق، بۆ ناوچەی هۆرەکانی ناسریە.

ئـــەو ســـــەربازەی لەگەڵـــم بـــوو، ڕووی لـــە پیرەمێردەکـــە کـــرد وتـــی: خاڵـــە دڵـــی خـــۆت تونـــد مەکـــە، لەوانەیـــە لـــەو ڕۆژانـــە ئێمـــەش وەکـــو کوڕەکـــەی تـــۆ بگوازرێینـــەوە بـــۆ وەحدەیەکـــی تـــری ســـەربازی. چونکـــە ئـــەو بنکەیـــە، تەنهـــا بۆماوەیەکـــی کاتـــی ســـەربازی لـــێ دەمێنێتـــەوە. دوای تەواوکردنـــی مەشـــق و ڕاهێنـــان، هەرکەســـەو بەپێـــی پســـپۆڕیەکەی بـــۆ وەحدەیەکـــی تـــری ســـەربازی دەگوازرێتـــەوە.

پیرەمێردەکـــە لەگـــەڵ قســـەکانی ئـــەو ســـەربازە هەناســـەیەکی هاتەوەبـــەر وتـــی: کـــوڕی خـــۆم خـــوا خێـــرت بنووســـێت کـــە دڵـــت خۆشـــکردم، منیـــش بـــۆ ئـــەوە هاتوومـــە، ناگەڕێمـــەوە هەتـــا چـــاوم بـــە ئامیرەکەتـــان نەکـــەوێ و ســـۆراغێکی کوڕەکـــەم وەرنەگرمـــەوە. بـــەم شـــێوەیە، بـــەدەم قســـەکردنەوە، بەخۆشـــم نەمزانـــی چـــۆن ئـــەو ڕێگایـــە دوورەمـــان بـــڕی و گەیشـــتینە شـــاری کەرکـــوک.

بەهەرســـێکمان تەکســـییەکمان گـــرت و چووینـــە بنکـــەی مەشـــق و ڕاهێنانـــی ســـەربازی.

کـــە گەیشـــتینە جـــێ، ئـــەو کـــوڕەی لەگەڵـــم بـــوو، لـــە بابولنیزامەکـــە ماڵئاوایـــی لێکردیـــن وتـــی: مـــن دواکەوتوومـــە، دەبـــێ هـــەر ئێســـتا بچمـــە ســـاحەی عـــەرەزات، دەنـــا بـــە نەهاتـــوو نـــاوم تۆمـــار دەکـــەن. پیرەمێردەکـــەش لەگـــەڵ ســـەربازێک چـــووە لای ئامیـــر. منیـــش جانتایەکـــەم بـــە شـــانم وەکـــردو چوومـــە قەڵەمـــی بنکەکـــە.

نوســـراوەکەیان لـــێ وەرگرتـــم و دوای چاوتروکانێـــک کارەکەیـــان بـــۆ تـــەواو کـــردم و لەگـــەڵ ئینزباتێـــک منیـــان بـــردە کـــۆگای کەلوپەلـــی ســـەربازی و دەســـتێک جلوبەرگی ســـەربازی و دوو بەتانیاو بالیفێکیان دامـــێ، وتیـــان بـــڕۆ بـــۆ فەســـیلی یەکـــەم لـــە ســـریەی دوو. منیـــش وتـــم جـــا چـــۆن بزانـــم شـــوێنی ئـــەو فەســـیلە لەکوێیـــە؟ ئینزباتەکـــە وتـــی (ڕاســـت بـــڕۆ لـــە کۆتایـــی شـــەقامەکە بـــە دەســـتی چـــەپ

ئـاوڕ بـدەوە، هۆڵێکـی گـەورەو دوو ژووری بچووکـت دێتـە بەچـاو، ئـەوە بـارەگای سـریەی دووەو ژووری ئامیـر فەسـیڵی یەکەمیـش لـە تەنیشـت ئـەو هۆڵەیـە. پسـووڵەکەیان بـدەرێ و وەرت دەگـرن.
جانتایەکـەم بـە شـانم وەکـردو هـەردوو بەتانیەکانیشـم خسـتە سـەر شـانم و بـە دەسـتەکەی تریشـم جلوبەرگـە سـەربازیەکانم هەڵگـرت و بـەدەم خەیاڵـەوە بـە شـەقامەکەدا شـۆڕبوومەوە.
هـەر بـەدەم ڕێـگاوە، لـەم بـەرو ئـەو بـەری شـەقامەکە، لـە دووریـی چەنـد مەترێکـەوە چـاوم بـە چەنـد گرووپێـک سـەرباز کـەوت، مەشـق و ڕاهێنانیـان پێدەکـردن، ناوەنـاوەش هەڕوەڵەیـان پێدەکـردن.
کـە تەماشـایەکی ئـەو دیمەنـەم کـرد، بـۆم دەرکـەوت ئیتـر لەمـەولا ژیانێکـی زۆر جیـاوازم دەبـێ، ڕەنگـە هـەر ڕۆژێکـم بـە سـاڵێک لـێ بـڕوات.
بەهەرحـاڵ، گەیشـتمە کۆتایـی شـەقامەکە، ئاوڕێکـم لـە دەسـتە چەپـی خـۆم دایـەوە، هۆڵێکـی گـەورەو دوو ژووری بچووکـم لـێ بەدیارکـەوت. بـەرەو ئاراسـتەی هۆڵـە گەورەکـە ڕۆیشـتم و لێـی نزیـک بوومـەوە. ئەفسـەرێک و نائیـب زابتێـک و ئینزباتێـک لەبـەر دەرگای هۆڵەکـە وەسـتابوون. چوومـە لایـان، سـڵاوم لێکـردن و پسـووڵەکەم دایـە ئەفسـەرەکە و پێـم وت: گـەورەم لـە قەڵەمـی بنکـە ئـەم پسـووڵەیان پێـدام، وتیـان بیبـە بـۆ سـریەی دوو بـا نـاوت لای خۆیـان نەشـر بکـەن.
ئەفسـەرەکە پسـووڵەکەی لـێ وەرگرتـم و دایـە دەسـت سـەربازێک وتـی: هـەر ئێسـتا نـاوی لـە قەڵەمـی سـریە نەشـربکە. ڕوی لـە ئینزباتەکـەش کـرد پێـی وت: هـەر ئێسـتا ئـەم سـەربازە لەگـەڵ خـۆت ببـە بـۆلای ڕەئیـس عورەفـا شـێرکۆ بـا لـە فەسـیڵەکەی خـۆی مەشـق و ڕاهێنانـی پێبـکات.

منیش وتم: گەورەم ئەدی ئەو بەتانی و کەلوپەلانەم لەکوێ دابنێم؟ بە تووڕەییەوە وتی: لەسەر سەرمی دابنێ.
کە ئەمەی وت، لەشوێنی خۆم حەپەسام، لەترسان نقەم لێوە نەهات. ئینزباتەکە زانی زۆر خەفەتم خوارد، بۆیە دەستێکی خستە سەر شانم و بەپێکەنینەوە وتی: ئەبوخەلیل خەفەت مەخۆ، ئیتر لەمەودوا دەبێ لەو جۆرە قسانە ڕابێیت، ئەوە سەربازییە، ژیانێکی ترە.
کە گەیشتینە لای فەسیڵی یەکەم، ئینزباتەکە قاچەکانی بۆ ڕەئیس عورەفای فەسیڵ لە زەوی داو سڵاوی سەربازی لێکرد، وتی: ئەم کوڕە قۆزەم بۆت هێناوە، تازە بۆتە سەرباز.
ڕەئیس عورەفا شێرکۆش ڕووی لەمنکردو پێی وتم: ئەم بەتانی و جانتایەت لە شوێنێک دابنێ و بە خێرایی جلوبەرگی سەربازی بپۆشە، پۆستاڵەکانیشت لەپێ بکەو وەرە ڕیزی سەربازەکانی فەسیڵ، مەشقیان لەگەڵ بکە.
ئیتر بەم شێوەیە، جانتاو بەتانیەکانم لە نزیک ساحەی عەرەزات دانا و بە خێرایی جلوبەرگەکانم لەبەر کردو چوومە لای ڕەئیس عورەفا شێرکۆ سڵاوم لێیکرد. وتی ئەمڕۆ لێتناگرم، بەڵام لە بەیانییەوە دەبێ وەکو ئەو ئینزباتە قاچەکانت بە توندی لە زەوی بدەیت و ئینجا سڵاو بکەیت. وتم: باشە گەورەم. وتی: مەڵێ گەورەم، ئەم دەستەواژەیە تەنیا بۆ ئەو کەسانە بەکاردێت، کە ئەستێرەو داڵیان لەسەر شانە، بۆئەوانی تر تەنیا سڵاوی سەربازییان لێدەکەیت.
بەم شێوەیە، منی خستە ڕیزی سەربازەکان و تاکو نیوەڕۆ هاتوچۆ و هەڕوەڵەی پێکردین. دوایی وتی: بەرەو هۆڵی فەسیڵ ڕاکەن.
یەکێک لە سەربازەکان هاتە لام وتی: (من ناوم ئازادە،

خەڵکی شاری سلێمانیم). منیش خۆم پێی ناساند وتم: منیش خەڵکی شاری هەولێرم.
وتی: یان جانتایەکەتم بدەرێ یان بەتانیەکان، تا هۆڵی خەوتن بۆت هەڵدەگرم. منیش جانتایەکەم دایەو ئەوانی تریشم بەخۆم هەڵگرت و بەرەو لای هۆڵی خەوتن ڕۆیشتین.
هەر بەدەم ڕێگاوە باسی ژیانی سەربازی بۆکردم، وتی لێرە مرۆڤ هیچ بەهایەکی نییە، وەکو ئاژەڵ فەرمانی پێدەکەن، ماوەیەکی زۆری دەوێ تاکو مرۆڤ لەو ژیانە نوێیە ڕادێت.
کە گەیشتینە هۆڵەکە، ئازاد شوێنێکی لە تەنیشت خۆی بۆ کردمەوە وتی: ئەگەر حەزبکەی لەمەولا ئەمە شوێنی خەوتنی تۆیەو هەر بەیەکەوەش لە قسعەیەک چێشت دەخۆین. منیش ستایشم کرد وتم: من هیچ شتێک لەبارەی ژیانی سەربازی نازانم، من سێ برام هەیە، لەمەولا تۆش برای چوارەمی منی، ئەگەر تۆ قبوڵی بکەیت.
بەپێکەنینەوە وتی: جا خوشک و براکانمان بەئێمە چی، لەمەودوا تەنها ئێمە بەکەڵکی یەکتری دێین، ئێرەماڵی دووەممانە، وا زوو تەسریح نابین.
کە ئەمەی وت مووچرکێک بە لەشمدا هات و تارماییێک چاوەکانمی پۆشی، پێم وت: ئەی بۆچی لە دەفتەرخدمەکەم نووسیویانە بۆ ماوەی سێ ساڵ خزمەت بکات؟
وتی: ئەوە هەر قسەیە، بۆ مەوالیدەکانی پێش ئێمەش هەمان شتیان نووسیوە، ساڵێک بەسەر خزمەتەکەیان ڕەتبووە، کەچی هێشتان تەسریح نەکراون.
منیش وتم: کەواتە پێم بڵێ گۆڕێک بۆ خۆت هەڵکەنەو خۆت بخە ناوی!!
وتی: نا بەم شێوەیەش نییە، نابێ لێرە فەرمانەکان بە

جددی وەربگرین، ئەوانەی پێش ئێمە وتەیەکیان هەیە، دەڵێن (سەربازی تەواو نابێت بە کلاوات نەبێت). هەر لە درێژەی قسەکانیدا وتی: لەمەودوا خۆت هێندە فەقیرحاڵ مەکە، تاکو پێت دەکرێ بە کلاوات بیبەسەر.
کە ئەمەی وت، هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا، بیرم لە قسەکانی ئەو سەربازە کردەوەو لەبیری خۆمدا دەموت (ئەوە بۆیە نائیب زابت ئەمجەدو نائیب عەریف سابیر مزووری زۆریان پێناخۆش بوو کە چوومە سەربازی. تومەز ئەوانیش لەم ژیانە ناخۆشە تێوە گلاون و هیچ چارەیەکیشیان نییە). ئەمەو چەندین بیرۆکەی ترم بەخەیاڵدا دەهات. جەستەم لە شوێنی خۆی بەجێمابوو، خەیاڵیشم بۆ شوێنێکی دوور ڕۆیشتبوو.
کاتێک لە ساڵی ١٩٧١ ماڵمان لە سێتاقان گواستەوە بۆ گەڕەکی موفتی، ئەوەی مەلافەندی زۆر لەمێژ نەبوو زەوییەکانی ئەوێیان فرۆشتبوو. باوکیشم پارچە زەوییێکی شەش سەد مەتری کڕیبوو، بە قۆنتەرات دابوویە وەستا محەمەد ئەبوشوارب بە سێ هەزار دینار دوو خانووی کراوەی بۆ دروستکردبووین. کە ئێمە چووینە ناوخانووەکەمان، جگە لە ئێمە تەنها چوار ماڵی لێ بوو، ماڵی ڕەحمان سەرووپێ و سەعید پینەدۆزو وەستا عەلی باداوەیی و ڕەفیق چایەچی. دەورووپشتیشمان تا دەگەیشتە گوندی باداوەی مەلافەندی هەمووی چۆڵ بوو. ئێمە لەگەڵ ئەو دراوسێیانە، وەکو خزممان لێهاتبوو، شەوانە یەکتریمان بەسەردەکردەوە و هەر شەوەی لە ماڵێک کۆ دەبووینەوە. ڕەحمان سەرووپێ زۆری خۆشدەویستم، منیش زوو زوو دەچوومەوە ماڵیان و پەیوەندیم لەگەڵی زۆر باش بوو. ئەو کۆمەڵێک کچی هەبوون، یەک لەیەک جوانتر بوون، یەکێکم لە کچەکانی لەدڵی خۆم زۆر

خۆشدەویست، بەڵام هێندە لەگەڵ یەکتری تێکەڵاو بووین، وەکو خوشک و برامان لێهاتبوو، بۆیە شەرمم دەکرد پێی بڵێم تۆم خۆش دەوێ. پێش ئەوەی لە ئەمینداریێتی شارەوانی و هاوینەهەوارەکان دابمەزرێم، ڕۆژێک حەسەن حوسێن ئەڵلاداد کە سەرۆکی یەکێتی قوتابیانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی بوو، لە دوای ناردم، پێی وتم (دەزانم ئێوە باری داراییتان باش نییە، نووسراوێکمان بۆ هاتووە هەندێک کەسیان پێ دەوێت لەسەر میلاکی جەیشی شەعبی دایانمەزرێنن، ئەگەر ئارەزوو بکەیت پشتگیریت دەکەم). منیش وتم بیری لێدەکەمەوەو دواتر وەڵامت دەدەمەوە. لەڕاستیدا هیچم لێی نەدەزانی، تەنانەت نەشم دەزانی جەیشی شەعبی جیاوازی لەگەڵ جەیشی ئاسایی چییە، بۆیە چوومە لای کاک ڕەحمان و پێم وت نیازم وایە لەسەر میلاکی جەیشی شەعبی دابمەزرێم. هێشتان قسەکانم تەواو نەکردبوون، ئەو دابەزییە سەریان و هەزار جوێنی بەوان و بە حەرەس قەومییەکان دا، وتی (نەکەیت ئەو هەڵەیە بکەیت، ئەوانە سەگ و سەگبابن، وێنەیەکی ڕاستەقینەی حەرەس قەومییەکانن). منیش وتم حەرەس قەومییەکان کێن و چیانکردووە، وا تۆ لێیان داخ لەدڵیت؟ وتی (ئەوانە بەعسییە قەومییەکان بوون، زۆر ڕقیان لە کورد دەبۆوە، هەڵیان دەکوتا سەر ئەو خەڵکە بێتاوانەو زەخیرەکانیان لێ تێکەڵی یەکتری دەکردو پارەو ئاڵتوونەکانیشیان دەدزی و پیاوەکانیشیان ڕاپێچ دەکردو دەیانخستنە زیندانەکانیانەوەو بە شێوازێکی دڕندانە ئەشکەنجەیان دەدان). کە ئەمەی وت، دەستەکانیم ماچکردو پێم وت: من هیچ زانیاریم لەسەر ئەوانە نەبوو، ئەگەر تۆ پێت نەوتبام، ئەو هەڵەیەم دەکردو شەرمەزاری دونیا و قیامەتیش دەبووم.

مـن لەنـاو ئـەو خەياڵانـەدا بـووم، لەنـاكاو ئـازاد بـە دەنگێكـی بـەرز پێـی وتـم: جـارێ تـۆ چیـت بینیـوە وا كەوتوویتـە نـاو دەریـای خەیـاڵ؟!
لەگـەڵ دەنگی ئـازاد راچڵەكیـم، خەیاڵـم پچـڕا و هاتمـەوە دونیـای سـەربازی و پێـم وت: ببـوورە خەیاڵـم بـۆ شـوێنێكی زۆر دوور ڕۆیشـتبوو، گەڕابوومـەوە سـاڵانی ڕابـردوو، بۆیـە ئـاگام لێـت نەبـوو.
وتـی: بیـر لـە ژیانـی ڕابـردوو مەكـەوە، ئـەو ڕۆیشـت و ناگەڕێتـەوە، ئێسـتا تـۆ سـەربازیت، هەوڵبـدە خـۆت لـەم ژیانـە نوێیـە ڕابهێنـە، بـەڵام زۆر بـە جددیـش وەری مەگـرە، دەنـا ئـەم سـەربازیەت قـەت پـێ تـەواو نابێـت.
منیـش وتـم: ڕاسـت دەكـەی، هـەر لـەم ساتەوە، لاپەڕەیەكـی نـوێ لـە ژیانـم هەڵدەدەمـەوە، وەكـو وتـت لەمـەودوا شـتەكان بـە فشـە وەردەگـرم و بـە كلاوات بەسـەرێ دەبـەم.
ئـازاد فانیلـەو دەرپێـی ژێـرەوەی خسـتە نـاو تەشـتی قسـعەكە و لەگـەڵ تایـت و ئـاوی گـەرم دەسـتیكرد بـە شـۆردنیان.
ئـەم دیمەنـە زۆر سـەرنجی ڕاكێشـام، لەدڵـی خۆمـدا وتـم (تاكـو ئێسـتا هـەر دایكـم جلەكانـی بـۆ دەشوشـتم، لەمـەودوا دەبـێ منیـش وەكـو ئـازاد خـۆم فێـری جـل شـۆردن بكـەم).
ئازاد سەیری منی كرد وتی: دیسان بۆكوێ ڕۆیشتی؟
وتـم: كـە تـۆم بینـی جلەكانـی خـۆت دەشـۆیت، بیـرم لـە حاڵـی خـۆم دەكـردەوە، دەبـێ منیـش لەمـەودوا وەكـو تـۆ خـۆم لـەم كارانـە ڕابهێنـم.
بەپێكەنینـەوە وتـی: جـارێ لەكوێتـە، زۆر شـتی تـر مـاوە دەبـێ بیانكەیـت. وەكـو پێشـتریش وتـم، سـەربازی ژیانێكـی تـرە، زۆر جیـاوازە لـە ژیانـی ماڵـەوە، بـە خۆڕایـی نەیانوتـووە (ئـەوەی سـەربازی نـەكات نابێتـە پیـا و).

زۆرم خەو دەهات، دووری ڕێگا و مەشقکردن زۆر ماندوویان کردبوم، بۆیە لەسەر جێگایەکەم لێی ڕاکشام.
هێشتان بەتەواوی چاوەکانم گەرم نەکردبوون، ئازاد بانگی کردم وتی: هەستە، کاتی وەرگرتنی قسعەیە.
منیش وتم قسعەی چ کاتێکە؟
وتی: گوێت لە دەنگی سافیرەکە نیە؟
وتم: با گوێم لێی بوو، ئەمە مانای چییە؟
وتی: ئەم سافیرە درێژە بۆیە لێدەدرێت تاکو بچین خواردن وەرگرین، دەنا بەشمان نامێنێ و بەبێ خواردن دەمێنینەوە. ناچار بووم، هەستامەوەو ئاوێکم بە دەموچاومدا کرد. داوام لێیکرد کە سینییێکم بداتێ تاکو بچم خواردن بۆخۆی و خۆم وەربگرم.
ئازاد تەشتی قسعەکەی هەڵگرت وتی: بەیەکەوە دەچین خواردن وەردەگرین.
تەشتەکەی دەست ئازاد، هەمان ئەو تەشتە بوو کە جلەکانی لەناو شوشت. زۆر قێزم بۆوە، بەڵام لەشەرمان هیچ قسەم نەکردو لەگەڵی ڕۆیشتم. هەردووکمان چوینە بەردەم چێشتخانەکە، ئینزباتێک لەوێ ڕاوەستابوو، سەربازەکانی ڕیز دەکرد. ئێمەش چووینە ناو ڕیزەکەوە.
لەناو چێشتخانەکە، دوو مەنجەڵی گەورەی بەقەد بەرمیلێک لەسەر ئاگرەکە بوون. چێشتلێنەرەکە خاکەناسێکی گەورەی بەدەستیەوە گرتبوو، ئەوەی دەگەیشتە بەردەمی، خاکەناسێک برنج و کەوگیرێکی گەورەی مەرەگەی بۆ تێدەکردو دوو سێ پارچە گۆشتیشی بە کەوگیرەکە دەردەهێناو بۆی دەخستە سەر برنجەکە.
بەم شێوەیە، یەکە یەکە سەربازەکانی بەڕێدەکرد، تا نۆرەی ئێمەش هات و بەشە خواردنی خۆمان وەرگرت.
لەڕێگای گەڕانەوەدا بیرم هەر لەلای تەشتی قسعەکە بوو.

لەبەرچاوم فانیلە و دەرپێ قوتەکەی ئازاد لەگەڵ برنج و مەرەگەکە تێکەڵی یەک ببوون. زۆر قێزم دەبۆوە، بەڵام دانم بەخۆمدا گرت.

کە گەیشتینە جێ، ئازاد قسعەکەی لەبەردەمی خۆم و خۆی دانا وتی: چاوەڕێی چی دەکەی، با نانەکە بخۆین، تاکو سارد نەبۆتەوە.

وتم: هیچ برسیم نییە، تۆ نانی خۆت بخۆ هەقت لەمن نەبێ.

لێم تێگەیشت، بە پێکەنینەوە وتی: تۆ برسیتە، بەڵام دەزانم بۆچی وا دەڵێی؟

ویستم قەناعەتی پێبێنم کە برسیم نییە، بەڵام ئەو وازی لێ نەهێنام، زۆر پێداگری کرد کە نانی لەگەڵ بخۆم، وتی: ئێمەش کە یەکەم ڕۆژ هاتینە ئێرە وەکو تۆ بووین، قێزمان لە هەموو شتێک دەبۆوە، بەڵام دواتر لێڕاهاتین، ئەم تەشتەش جلی لەناو دەشۆین و چێشتیشی لەناو دەخۆین. نەمویست دڵی بشکێنم، زۆریم لەخۆم کردو لە تەشتی نان خواردنەکە نزیک بوومەوە، بەڵام هەرچەندی کردم بێزم نەهات نانبخۆم.

وتی: خۆ ئێرەماڵەوە نییە، بە چەقۆ و چەنگاڵ نان بخۆیت. ئێرە سەربازییە، قۆڵەکانت هەڵکە و دەست درێژبکە، سەیری من بکە، وەکو من برنج و مەرەگەکە لوولبدە و بیخە ناو دەمتەوە.

هەرچەند زۆریش برسیم بوو، بەڵام نەمتوانی بیخۆم. کە سەیری تەشتەکەم دەکرد، فانیلە و دەرپێ قوتەکەی ئازادم دەهاتەوە بەرچاو.

بەهەرحاڵ، توانیم ئەو ڕۆژە بەرگەی برسێتی بگرم و نان نەخۆم. لەسەر پشت لێی ڕاکشام و چاوەکانم خستنە سەریەک، هەندێک پشووم دا.

هێشــتان بەتەواوەتــی خــەو نەچووبــووە چاوەکانــم، گوێــم لــە ســافیرەیەکی درێژبــوو. ســەرم بەرزکــردەوەو ڕووم لــە ئــازاد کــرد، پێــم وت: ئــەی خــواردن دابــەش نەکــرا، ســافیرەی ئەمجــارە بۆچییــە؟

بەپێکەنینــەوە وتــی: ســافیرەی ئەمجــارە بــۆ دابەشــکردنی خــواردن نییــە، بەڵکــو بــۆ مەشــقی ئێوارانــە. لێــرە هەمــوو فەرمانەکانیــان بــە ســافیرە پێمــان دەگەیەنــن.

منیش وتم: بۆچی ڕۆژی چەند جار مەشق دەکەین؟

وتــی: ســێ جــار مەشــقمان پێدەکــەن، بەیانیــان پێــش ئــەوەی ڕۆژ هەڵبێــت مەشــقمان پێدەکــەن تاکــو کاتژمێــر دەی بەیانــی، دوایــی پشــووێکی کورتمــان دەدەنــێ و پەرتەمــان پێدەکــەن بــۆ خواردنــی قاوەڵتییێــک. دوای نیــو کاتژمێــر دووبــارە دەگەڕێینــەوە گۆڕەپانــی مەشــقکردن و تاکــو ســەعات یەکــی نیــوەڕۆ مەشــقمان پێدەکــەن، دوایــی تاکــو ئێــوارە ئیزنمــان دەدەن.

ئێمــە لــەم قســانەدا بوویــن، ئامیــر فەســیڵەکەمان ڕەئیــس عورەفــا شــێرکۆ هاتــە هۆڵەکــە و بەدەنگێکــی بــەرز بــە تووڕەیــی وتــی: دەڵێــی گوێتــان کــەڕ بــووە، دەمێکــە ســافیرە لێــی داوە، کەچــی ئێــوە بــێ خــەم لێتــان پاڵداوەتــەوەو خەریکــی چەنەبازیــن.

بــە ئــازادم وت: ئــەو ڕەئیــس عورەفایــە نەخوابــێ کوردیشــە کەچــی زۆر بــە خراپــی هەڵســوکەوتمان لەگــەڵ دەکات.

ئــازاد وتــی: جــارێ تــۆ چیــت بینیــوە، ئەمــە لێڵێیــە، جــارێ لۆلۆشــت مــاوە، لێــرە کــەس بــرای کــەس نییــە، ســەرپێچییێکی بچــووک بکەیــت ســزات دەدەن و چاوپۆشــیت لــێ ناکــەن.

کــە گەیشــتینە گۆڕەپانــی عەرەزاتەکــە، ڕەئیــس عورەفــا شــێرکۆ وتــی: فەســیڵ ڕاوەســتن. دوای ئــەوەی بەیــەک ئیعــاز هەموومــان لــە شــوێنی خۆمــان ڕاوەســتاین، ئەوجــا وتــی: فەســیڵ وریابــن،

فەسیڵ پشوودەن، بۆ پێشەوە وەرگەڕێن، بە ئاسایی بڕۆن.
دوای ئەوەی چەند سەد مەترێک ڕۆیشتینە پێشەوە، بە دەنگێکی بەرز وتی: بۆ دواوە وەرگەڕێن، بەشێوەیەکی ئاسایی بڕۆن.
بەم شێوەیە، نزیکەی دوو کاتژمێر مەشقی پێکردین، ئینجا پەرتەی پێکردین و بەرە و هۆڵەکەمان گەڕاینەوە.
جلە سەربازیەکانم لەبەر کردەوە، تراکسودەکەم لە جانتاکەم دەرهێنا و لەبەرم کردو لەسەر جێگایەکەم لێی ڕاکشام.
هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا، خەیاڵم بۆلای هاوڕێکانم ڕۆیشت.
ئەو ڕۆژە خۆشانەم بەبیر دەهاتنەوە کە لەگەڵ زیاد مەندۆ و تاهیر و قارەمان قولی و قارەمان قشپل بەخۆشی بەسەرماندەبرد.
لە نزیک بیری ئیرتوازی گەڕەکەکەمان قوتابخانەیەکی گەورەی ئامادەیی کچانیان دروستدەکرد. ڕۆژێک من و زیاد مەندۆ پلانێکمان بۆ قارەمان قشپل داڕێشت، ڕێککەوتین کە هەرسێکمان بچین لەناو ئاوی حەوزی قوتابخانەکە مەلەوانی بکەین، دواتریش پەندێک بە قارەمان بکەین. ئەوەبوو بەیەکەوە ڕۆیشتین، قارەمان چاوەڕێی ئێمەی نەکرد، هەر زوو خۆی ڕوت کردەوەو بە قوونی ڕووت خۆی فڕێدایە ناو حەوزی ئاوەکە و دەستی کرد بە مەلەکردن.
من و زیاد مەندۆش دوای ئەوەی هەندێک پێمانڕابوارد، ئینجا جلەکانیمان بەدەستەوە گرت و وتمان (جلەکانت بۆ دایکت دەبەین و پێی دەڵێین قارەمانی کوڕت قوونی داوە، ئەگەر بڕواش ناکەیت، ئەمەش جلەکانی).
کە ئەمەمان وت، قارەمان دەستی بەجوێندان کردو بە خێرایی لە ئاوەکە هاتە دەرەوەو بە قوونی ڕووت بەدوامان کەوت.
باجی ئامینی دایکی قارەمان ژنێکی ڕووخۆش و گاڵتەچی بوو،

ڕۆژانــە لەگــەڵ کــچ و ژنانــی گــەڕەک لەبــەردەرگای ماڵــی خۆیــان کۆدەبوونــەوەو بــەدەم گوڵەبــەڕۆژە خواردنــەوە نوکتــە و قســەی خۆشــی بــۆ دەکــردن.

کــە گەیشــتینە لایــان، جلەکانــی قارەمانمــان فڕێدایــە کۆشــی باجــی ئامینــە و پێمانــوت (جلەکانــی کوڕەکــەت وەرگــرە، ئابــڕووی خــۆی و ئێمەشــی بــردووە خەریکــی قووندانــە).

کــە ئەمەمــان وت، لــە قاقــای پێکەنینــی دا وتی (دیســان چ تۆپێنێکــی ترتــان لەژێــر ســەردایە، چیتــان لــە کوڕەکــەی مــن کــردووە؟)

پێــش ئــەوەی وەڵامــی بدەینــەوە، قارەمــان گەیشــتە لامــان. دەســتێکی لەســەر قونــی بــوو، بــە دەســتەکەی تریشــی کیــرو گونــی خــۆی شــاردبۆوە، لــە توڕەییــان ئاگــر لــە هــەردوو کونەلوتــی دەهاتــە دەرێ، هەرچەنــد جوێنــی پیــس هەیــە بەئێمەیــدا، ئەیــوت (ئێــوە هیــچ شــەرەفتان نیــە، دەنــا فێڵتــان لەمــن نەدەکــرد).

زیــاد مەنــدۆش بــە پێکەنینــەوە پێــی وت (کــوڕم ئــەوە تــۆی شــەرەفت نییــە، شــەرم ناکەیــت قــوون دەدەیــت، ئەگــەر لەبــەر خۆشــت نەبــێ، لەبــەر ئــەو دایکــە بەســتەزمانەت ڕەحمێــک بــە قوونــت بکــە).

کــە زیــاد ئەمــەی وت، قارەمــان هێنــدەی تــر هەڵچــوو، دەســتەکانی لــە زیــاد بــەرز کــردەوەو تونــد یاخــەی گــرت، هەوڵیــدا بیخنکێنــێ. باجــی ئامینــەش هیــچ خــۆی تێکنــەدا، بــە قارەمانــی وت (کــوڕم بۆچــی تێناگەیــت، ئــەوان یاریــت لەگــەڵ دەکــەن، بــە گاڵتــە ئــەو قســانەت پێدەڵێــن. تــۆش وەکــو ئــەوان زیــرەک بــە و تۆڵــەی خۆتیــان لێبکــەوە، ئــەی پێشــینان نەیانوتــووە ڕۆژان ڕۆژی لەدوایــە).

لەنــاو ئــەو خەیاڵــە خۆشــەدا بــووم، جارێکــی تــر ســافیرەکە لێــی دایــەوە، ڕاچڵەکیــم، ڕووم لــە ئــازاد کــردو پێمــوت: چــی ڕوویــداوە، ئــەم ســافیرەیان بــۆ لێــداوە؟

بەپێکەنینــەوە وتــی: بــێ قەزابــی تــۆ دەمێکــە لێــی پاڵکەوتــووی، خەیاڵــت بــۆ شــوێنێکی دوور ڕۆیشــتبوو، حــەزم نەکــرد خەیاڵــت بپچڕێنــم بۆیــە قســەم لەگــەڵ نەکــردی. خەریکــە ڕۆژ ئــاوا دەبێــت، ئێســتا کاتــی نانخواردنــە و دەبــێ بچیــن چێشــتی ئێــوارە وەربگریــن.
منیــش وتــم: بەدەســت خــۆم نییــە، هەرچەنــدی هــەوڵ دەدەم بیــرەوەری هاوڕێکانــی لــە مێشــکم دەرناچێــت.
ئــازاد دەســتی خســتە ســەر شــانم وتــی: منیــش کــە تــازە ببوومــە ســەرباز شــەو و ڕۆژ خەیاڵــم لــەلای هاوڕێکانــم و خانەوادەکــەم بــوو. بــەڵام دوایــی وردە وردە لێڕاهاتــم، ئێســتا زۆر کــەم بیریــان دەکــەم. تــۆش وەکــو مــن لێڕادێیــت، باشــتر وایــە هێنــدە بیریــان لــێ نەکەیتــەوە، ئێســتا تــۆ ژیانێکــی تــرت هەیــە جیــاوازە لــە ژیانــی پێشــووت.
وتــم: هــەوڵ دەدەم لەمــەودوا جڵــەوی مێشــکم لەدەســت بگــرم و زۆر بیریــان لــێ نەکەمــەوە.
تەشــتی قســەکەمان هەڵگــرت و بــەرەو چێشــتخانەکە ڕۆیشــتین و چێشــتی ئێوارەمــان وەرگــرت و گەڕاینــەوە هۆڵەکەمــان.
زۆر برســیم بــوو، لــە بەیانییــەوە هیچــم نەخواردبــوو، بۆیــە ئەمجــارە دانــم بەخۆمــدا گــرت و بێــزی خــۆم نەکــردەوە، قۆڵــو باســکی خــۆم لێــی هەڵکــرد، وەکــو ئــەو بەدەســتەکانم چێشــتەکەم خــوارد.
دوای چێشــتخواردن، بەیەکــەوە چووینــە حانوتــی ســەربازگەکەمان، هەندێــک شــیرینیمان کــڕی، دواییــش لای چایەچییەکــە، هــەر بــە پێــوە پەرداخێــک چایەمــان خــواردەوە. دوایــی گەڕاینــەوە هۆڵەکەمــان.
ئــەو ڕۆژە بۆمــن ڕۆژێکــی زۆر ناخــۆش بــوو، هــەر چرکەیەکــم بــە ســەعاتێک لــێ دەڕۆیشــت. وامدەزانــی زیندانــی کــراوم، دڵــم زۆر تونــد بــوو. ئەگــەر ئــەو هاوڕێیەشــم بــۆ پەیــدا نەبوایــە، بەجارێــک دڵــم شــەقی دەبــرد.

بەهەرحاڵ، چەند کاتژمێرێکمان بە قسەی خۆش بەسەربرد، زۆرم خەو دەهات، ویستم بخەوم، ئازاد وتی: جارێ مەخەوە، چونکە سەرژمێرییەکی تری شەوانیشمان ماوە، پاش کەمێکی تر سافیرەمان بۆ لێدەدەن و دەبێ ئامادەبین، دەنا بە نەهاتوو هەژماردەکرێین و سزا دەدرێین.

منیش وتم: بەو شەوە لە ساحەی عەرەزات چاو چاو نابینێ، ئەوان چۆن ئێمە دەبینن؟

وتی: ناچینە ساحەی عەرەزات، لەبەردەم هۆڵەکەمان ڕیز دەبین و تەنها سەرژمێرمان دەکەن بۆ دڵنیابوون لە ئامادەبوونمان، نەوەک ڕۆیشتبینە ماڵەوە یان بۆ شوێنێکی تر ڕۆیشتبین.

ئێمە لەو قسانەدا بووین، گوێم لە دەنگی سافیرەکە بوو، بە خێرایی پۆستاڵەکەمان لەپێ کردو لەگەڵ سەربازەکان لە بەردەم هۆڵەکە ڕیز بووین.

عەریف جابر ئێمەی ڕیزکردو دەستیکرد بە سەرژمێریکردنمان. کە بینی کەس غائیب نییە وتی: ستایش بۆ خوا ئەمڕۆ هەمووتان ئامادەن.

ئەمەی وت، ئینجا بە دەنگێکی بەرز وتی: فەسیڵ وریابن، پشووبدەن، وریابن، پشووبدەن، وریابن، پشووبدەن. چەند جارێک ئەم جووڵەیەی پێ دوبارە کردینەوە، دوایی وتی: فەسیڵ پەرتبن بۆ هۆڵەکانتان.

بەم شێوەیە مەشق و ڕاهێنانی ئەو ڕۆژەمان تەواوکردو بەرەو هۆڵەکانمان گەڕاینەوە. ئەمجارەیان گشت جلە سەربازییەکانم داکەندو تراکسودەکەم لەبەرکردو لەسەرجێگایەکەم لێی ڕاکشام. زۆر ماندووبووم، بۆیە خۆشم نەمزانی چۆن خەوم لێکەوت. ئەوەندە ماندوو شەکەت بووم، ئەو شەوە تەنانەت هیچ خەونێکیشم نەبینی.

بەیانی زوو، هێشتان ڕۆژ هەڵنەهاتبوو، لەگەڵ دەنگی سافیرە چاوەکانم کردنەوە، بینیم ڕەئیس عورەفا شێرکۆ بەسەرمانەوەیە، بە پۆستاڵەکەی لە قاچی ئەو سەربازانەی دەدا کە لە خەوقورسییان هەڵنەستابوونەوەو جوێنی پێدەدان.
بەم شێوەیە لە خەو هەستاین و بەپەلە بەرە و چێشتخانەکە ڕۆیشتین و قاپێک نیسکێنە و زەمزەمیێک چایە و دوو سەموونی مزاشیشمان هێنا و گەڕاینەوە هۆڵەکە. هەر بەخێرایی نانەکەمان خواردو ڕیشمان تاشی و پۆستاڵەکانیشمان بۆیاخکرد. هەندێک سەرباز هێشتان خۆیان ئامادە نەکردبوو کە سافیرەی دووەمیش لێیدا. بەپەلە خۆمان گەیاندە ناو ڕیزەکەو بەرە و ساحەی عەرەزات بەڕێکەوتین.
کە گەیشتینە ساحەی عەرەزات، ڕەئیس عورەفا شێرکۆ جارێکی تر سەرژمێری کردینەوە، ئینجا یەک یەک سەرو ڕیشی پشکنین، ئەوەی ڕیشی نەتاشیبوایە یان پۆستاڵەکەی بۆیاخ نەکردبوایە، ناوی لای خۆی تۆمار دەکردو دوای مەشق و ڕاهێنانی ئەو ڕۆژە، سەری بە نمرە سفر دەتاشی و شەوڕۆژێک دەیخستە بەندیخانەوە.
بۆ من سەربازی ژیانێکی زۆر ناخۆش بوو، هەرچەندی بیرم لێی دەکردەوە، نەمدەتوانی بەڕێکوپێکی بیبەمەسەر. بۆیە بڕیارم دا بە قسەی ئازاد بکەم و هەر لەسەرەتاوە هەموو شتێک بە فشە وەربگرم و بدەمەبەری و گوێی نەدەمێ.
هەرچۆنێک بێت، سێ مانگی مەشق و ڕاهێنانمان تەواوکرد، ئینجا نۆرەی دابەشکردن و گواستنەوەمان هات بۆ یەکە سەربازییەکانی تر بەپێی پێویستی و پسپۆری هەریەکێکمان.
ڕۆژانە سەدان سەربازیان دەگواستەوە بۆ کەتیبەکانی دەبابە و مودەڕەعە و کۆگاکانی چەک و تەقەمەنی و یەکەکانی پزیشکی

و ئەندازیـــاری. ڕۆژ لــەدوای ڕۆژ ژمارەمـــان کەمتـــر دەبـــۆوە، تـــا وای لێهـات چەنـد سـەربازێک لـەوێ مابووینـەوە، تەنانـەت ئـازادی هاوڕێشــم واسـیدەی کـرد، لەنـاو شـاری کەرکـوک لـە شـوێنێکی باشـیان دانـا.
گواســتنەوەی ئـــازاد زۆر کاری تێکــردم، ئەوەنـــدە ورەیـــەی کـــە هەشــمبوو لەدەســتم دا. زۆربـــەی پێنجشـــەممەو جومعـــان خـــۆم دەدزیـەوەو دەگەڕامـەوە هەولێـرو چـاوم بـە برادەرەکانـم دەکـەوت، ئەگــەر ئـــەوەم نەکردبـا دڵــم شــەقی دەبــرد.
دواجـار بڕیـارم دا ڕابکــەم، بۆیـە پێنـج شـەممە دوای تەواوبوونـی مەشــق گەڕامـــەوە هۆڵەکەمـــان، کەلوپەلەکانــی خــۆم خســتە نــاو جانتاکەمــەوە و بــەو نیــازە گەڕامــەوەماڵـــەوە.
باوکـم کەســێکی نیزامــی بــوو، حــەزی لــە لاســاری و ســەرپێچی نەدەکـرد، چونکـە پێشـتر سـەربازی لیڤـی ئینگلیـزەکان بـوو. کـە منــی بینــی، برۆکانــی جــووت بــوون، بــە تووڕەییــەوە پێــی وتــم: ئـــەو ماوەیـــە زوو زوو دێیتـــەوە، نـــاکات دەســتت بـــە خۆدزینـــەوە کردبێــت.
منیـش وتـم: نەخێـر شـتی وا چـۆن دەبـێ، مەشـق و ڕاهێنانەکەمـان تـــەواو کـــردووەو بـــەو هۆیـــەوە ئامیـــری ســـریەکەمان هەموومانـــی بــۆ چەنــد ڕۆژێــک ئیزنــداوە، دوایــی کــە گەڕاینـــەوە، بــۆ یەکــە ســەربازییەکان دەمانگوێزنــەوە. هەرچەنــد، ئەقڵــی قســەکانی منــی نەگــرت، بــەڵام بێدەنــگ بــوو، هیــچ قســەی نەکــرد.
قسـەی باوکـم زۆر کاری تێکـردم، وای لێکـردم لە بڕیارەکەم پەشـیمان ببمــەوەو ڕانەکــەم. دوای بیرکردنەوەیەکــی زۆر، خەیاڵەکانـم منیـان گەڕانـدەوە بـۆ ئەوکاتــەی کــە بەرپرســی خانــووە گەشـتیارییەکانی هاوینەهـــەواری پیرمـــام بـــووم. ڕۆژێـــک لـــە ئۆفیســـەکەی خـــۆم دانیشــتبووم، زەنگــی تەلەفۆنەکــەم لێیــدا، هەڵمگــرت.

ئەلوو؟
فەرموو تۆ کێی؟
بەرپرسی هەواڵگری عێراق ئەبوو محەمەد قسەت لەگەڵ دەکات.
فەرمانبکەن.
لەم ڕۆژانە بەڕێوەبەری گشتی تەموین و نەقلی وەزارەتی بەرگری لیوا بەکر وەهیب ئەلدووری دێتە لاتان بۆ بەسەربردنی کاتی پشوو. ئەگەر گەیشتە لاتان، ئاگادارمان بکەوە تاکو تیمی پاراستنی بۆ بنێرین و بیپارێزین.
فەرمانتە.
تەلەفۆنەکەم داخست و لە دەفتەری تۆماری خانووەکان ئەو تێبینیەم نووسییەوە. چەند ڕۆژێک تێپەڕی، ئێوارەیەک لە ئۆفیسەکەم دانیشتبووم، مارسیدسێکی ڕەش، لەبەردەم ئۆفیسەکەم وەستا. ئەفەندییەکی بە قەلافەت، چاکەت و پۆنتۆڵی لەبەردابوو، قەرەوێتێکی سەوزی بەستبوو، لە کوشنی پشتەوە دانیشتبوو. ئەفەندیێکی تریش لەپێشەوەی ئۆتۆمبێلەکە لە تەنیشت شوفێرەکە دانیشتبوو. ئەو ئەفەندیەی کە لە پێشەوە دانیشتبوو، هاتە خوارەوەو بەگورجی چووە لای دەرگای پشتەوەو دەرگاکەی کردەوە، ئەو ئەفەندیەش کە لە پشتەوە دانیشتبوو، هاتە خوارەوەو بەرەو لای من هات. سڵاوی لێکردم وتی (من نائیب زابتی سوپا ئەنوەر خالد ئەلدووریم، دەمەوێ خانوییێک بۆ دوو هەفتە بگرم، خۆم و خانەوادەکەم ماوەی پشووی تیا بەسەرببەم). منیش وتم (جارێ پشوویێک بدە، تاکو خانووێکت بۆ تۆمار دەکەم).
کە سەیری ئۆتۆمبێلەکەم دەکرد، هەروەها کە لە ئەتەکێتی هاتنە خوارەوەو چۆنێتی مامەڵەکردنی ئەوان لەگەڵ یەکتری، لەوکاتەدا پەیوەندییە تەلەفۆنیەکەی بەڕێوەبەری هەواڵگری باکوورم بیرکەوتەوە. لەبیری خۆمدا وتم (هەبێ و نەبێ،

ئەوکەسە بەڕێوەبەرە گشتییەکەی وەزارەتی بەرگرییە، کە بەڕێوەبەری هەواڵگری ناوەکەی پێدام. بەڵام واپێدەچێ ئەو زاتە بیەوێ ناوی خۆیم لێ بشارێتەوە، بۆیە خۆی بە نائیب زابت پێشکەشکرد. ئەم ئۆتۆمبێلە و ئەو جۆرە دانیشتن و ئەتەکێتە لە هی نائیب زابت ناچێت). بۆیە خۆم لە گێلیدا، لەجیاتی خانووی وەزیر و بەرپرسەباڵاکان، خانووێکی ئاساییم لە شوێنێکی لابەلا بۆی تەرخانکرد.
ئاوی ساردو چایەشم بۆی بانگ کردو ڕێزێکی زۆرم لێی نا. دواییش کارمەندێکم لەگەڵ نارد، خانووەکەی تەسلیمکرد. دوای کاتژمێرێک، پاسەوانی خانووەکان هاتە لام وتی (ئەو پیاوە کێیە خانووت داوەتێ؟) وتم: بۆ چی بووە؟ وتی (چەند مودەڕەعەیەکی سەربازی و دەیان سەرباز لە چواردەوری ماڵەکەی پەرت و بڵاو بونەتەوەو سەنگەر دروست دەکەن).
منیش وتم (ئەو کەسە پلەدارە لە وەزارەتی بەرگریی عێراق، چۆن من خۆم لە پلەکەی بێئاگا کردووە، ئێوەش ئەوها خۆتانی لێ بێئاگا بکەن، هەروا هەڵس وکەوتی لەگەڵ بکەن کە هیچ شتێکی لەبارەوە نازانن).
ئیتر ئەوەبوو بەخێرایی خۆم گەیاندەلای لیوا بەکر و پێم وت (گەورەم من هەر لە سەرەتاوە دەمزانی کە تۆ نائیب زابت نیت، بەڵام نەمویست تۆ بزانیت کە من ئەوە دەزانم. ئێمە بەرپرسی گەورە و پلەداری وەک بەڕێزتان عادەتەن لە خانووی وەزیرو پلەدارەکان دادەنێین، بەڵام من بە ئەنقەست ئەم خانووە ئاساییەم دایە تۆ، لەبەر چەند هۆیەک، تاکو وەکو هاوڵاتییێکی ئاسایی چێژ لە گەشتەکەت وەربگریت و تێکەڵ بە خەڵکی ئێرەش بیت، هەروەها بۆ پاراستنی ئاسایشی تۆ ئەمەم کردووە. ئەگەر ئاشکرابێت کە تۆ پلەداریت و لە

وەزارەتی بەرگریی عێراقیت، بەدووری نازانم کەسێک گورزێکی کوشندەت لێبدات و زیانت پێبگەیەنێ). ئەویش بە پێکەنینەوە پێی وتم ( ئەوە تۆ چی دەڵێی، ئەم هەموو سەربازەم لە دەورویشت بێت، کەس هەیە زیانم پێبگەیەنێت؟) وتم (کەسێک هەیە ناوی سولێمان بیرێژییە، ئەو ئێستا پێشمەرگەیە، خەڵکی ئەم ناوچەیەیە، چەند جارێک چالاکی چەکداری سەیروسەمەرەی لەم ناوچەیە ئەنجامداوە. دەگێڕنەوە، جارێک لەم نزیکانە کردەوەیەکی چەکداری دەنجام ئەدات، بەو هۆیەوە گشت مەفرەزەکانی ئەمن دەکەونە حاڵەتی ئامادەباشیەوە، بۆ دۆزینەوەی بەدوایدا دەگەرێن. هەر لەو کاتەدا ئامیر مەفرەزەیەکی ئەمن لەو چایخانەیە دانیشتووە کە ئەویش لێی دانیشتووە، کاتێک دەیەوێ بچێتە دەرەوە، کە پارەی چایەکەی دەدات، چایەچیەکە پێی دەڵێ پارەی چایەکەتان کەسێک بەناوی سولێمان بیرێژی داویەتی و ڕۆیشت).
کە ئەم ڕووداوەم بۆ جەنابی لیوا گێڕایەوە، لەترسان ڕەنگی وەکو ڕەنگی مردوو سپی هەڵگەڕا، وتی (من لە ساڵی ١٩٦١ تاکو ئێستا ئەوە یەکەم جارمە بێمە باکور و دوای ئەو ماوە زۆرە، ئێستا هاتووم دوو هەفتە لەگەڵ خانەوادەکەم پشوویێک بدەم و چەند ڕۆژێک بەخۆشی بەسەرببەم. بەڵام ئەوەی کە تۆ باسی دەکەیت، کارەساتە، ئەی ئەو هەموو هێزە سەربازی و ئەمنیانە ئیشیان چییە و چۆن خەڵک دەپارێزن؟). منیش وتم (ئەوەی لەسەر من بوو پێم وتی، بڕیاری کۆتاییش لەدەست خۆتە) وتی (بە ڕای تۆ چیبکەم باشە؟) وتم (بەو سەربازانە بڵێ بەزووترین کات ئێرە بەجێبهێڵن، پاراستنی تۆ لە ئەستۆی ئێمەیە، دڵنیات دەکەمەوە کە هیچ شتێکی خراپ ڕونادات).

کە ئەمەم وت، لیوا بەکر هاتە دەرەوەو رووی لە سەربازەکان کرد، پێی وتن (بە فەرماندەکەتان بڵێن بتانگەڕێنێتەوە ئەو شوێنەی کە لێی هاتوون، من پێویستم بە ئێوە نییە).
بەم شێوەیە، گشت سەربازەکان گەڕانەوە شوێنی خۆیان.
ڕۆژانە لیوا بەکر دەهاتە ئۆفیسەکەم، کاتێکی خۆشمان بەیەکەوە بەسەردەبرد. ڕۆژێک پیرە مێردێک قەرتارە ترێیەکی لەسەر پشتی گوێدرێژەکەی بار کردبوو، بەبەردەم ئۆفیسەکەم تێپەڕی. قەرتارە ترێیەکەم لێی کڕی لەگەڵ کارمەندێک بەدیاری بۆ لیوا بەکرم نارد. دوای تۆزێک، لیوا هاتە لام و ستایشی کردم و پێی وتم (لە سەردەمی حوکمڕانی عەبدولسەلام عارفەوە نەهاتوومەتە باکور، دەستەو دایەرەکانی حکومەت وێنەیەکی زۆر خراپی کوردیان لەبەرچاوم دروستکردبوو، دەیانوت /ئەوانە نەتەوەیەکی وەحشین، زۆر ڕقیان لە عەرەب دەبێتەوە، بیانبینن لەهیچی خۆڕایی دەیانکوژن/، کەچی ئەوەی لەو چەند ڕۆژە لەتۆم بینی، پێچەوانەی ئەم وێنایەیە کە لە مێشکی مندا بوو).
دوو هەفتە تێپەڕی، ئێوارەیەک لیوا هاتە لام وتی (حەزم دەکرد زیاتر لێرە بمێنمەوە، تەنانەت پێم خۆشبوو بەیەکەوە گەشتێکی چەندڕۆژە بۆ هاوینەهەواری سەرسەنگ بکەین، بەڵام دوێنێ لە وەزارەتی بەرگری پەیوەندییان پێوەکردم، داوایان لێکردم کە بە زووترین کات بگەڕێمەوە). هەر لە درێژەی قسەکانیدا وتی (بەیانی زوو دەگەڕێمەوە شاری بەغداد، لەوانەیە نەتوانم جارێکی تر سەردانتان بکەمەوە، بەڵام تۆ وەکو من نیت، لەبیرت نەچێ تۆ وەکو کوڕی منی، وەکو ئەو خۆشم دەوێیت، بۆیە هەر ئیش و کارێکت هەبوو، بێ دوودڵی وەرە لام، ئەوەی پێم بکرێ بۆتی دەکەم).

لەنـاو گەرمـەی ئـەم خەیاڵانـەدا، بیرۆکەیـەک بـە مێشـکمدا هـات، لەبیـری خۆمـدا وتـم (بۆچـی نەچمـە شـاری بەغـدادو سـەردانی جەنابـی لیـوا نەکـەم، داوای لێبکـەم شـتێکم بـۆ بـکات).
ئیتـر ئەوەبـوو، هـەر ئـەو ڕۆژە کەلوپەلەکانـم کۆکردنـەوەو خستمە نـاو جانتاکەمـەوەو ماڵئاواییـم لـە دایـک و بـاوک و خوشـک و براکانـم کـرد، چوومـە گـەراج و بـە سـواری پاسـێک بـەرەو بەغـداد بەڕێکەوتـم.
دوای نیـوەڕۆ گەیشـتمە گەراجـی نەهـزە و بـە تاکسـییێک چوومـە شـەقامی ڕەشـید بـۆ هۆتێلـی نـزار. ژوورێکـی یـەک نەفەریـم وەرگـرت و لەسـەر قەرەوێڵەکـە لێـی ڕاکشـام، تاکـو ڕۆژئاوابـوون لێـی خەوتـم.
کاتێـک بـە ئاگاهاتـم، ئاسـمان تاریـک ببـوو، هـەر بـە جلـی سـەربازیەوە تاکـو بـەردەرگای هۆتێلەکـە ڕۆیشـتم، لـە ترسـی ئینزباتـەکان نەموێـرا زۆر دووربکەومـەوە، لـە نزیـک هۆتێلەکـە چێشـتخانە و چایخانـەی لێبـوو. چوومـە چێشـتخانەی جمهـوری، برنـج و فاسـولیایەکی سـادەم بـە شـەش پەنجایـی خـواردو دوو چایـەی شیرینیشـم لـە قاوەخانـەی ئـوم کەلسـوم لەسـەری فرکـرد.

# چوونم بۆ وەزارەتی بەرگریی عێراق

بەیانی لەخەو هەستام چوومە چێشتخانەی جمهوری، قاپێک نیسکم بە دوو نانی گەرم خوارد. وەزارەتی بەرگری لە نزیک گۆڕەپانی مەیدان بوو، چەند هەنگاوێک لەو هۆتێلە دووربوو کە لێی دابەزیبووم، بۆیە هەر بە پێ ڕۆیشتمە ئەوێ و داوای بینینی جەنابی لیوام کرد.

بەرپرسی پرسگەکە بەسەرسوڕمانەوە سەیری کردم، ئەو جل وبەرگە سەربازییەی کە لەبەرم بوو زۆر ناڕێک بوو، سەرنجی ئەوی ڕاکێشا، بە تووڕەییەوە وتی: بڕۆ دەرەوە، تا بەگرتنم نەداوی، تۆ چۆن سەربازێکی، هەموو لەشت سەرپێچییە!!

هیچ وەڵامیم نەدایەوە، لووس و باریک گەڕامە دواوە، لە گەڕانەوەم بۆ هۆتێلەکە، بەدەم ڕێگاوە بیرم لە ڕێگاچارەیەک دەکردەوە کە پێی بتوانم بگەمە لای جەنابی لیوا و کێشەی خۆمی عەرزبکەم.

لە کۆڵانی تەنیشت چێشتخانەی جمهوری شوێنی لەنگە فرۆشتن بوو، جل وبەرگی مەدەنی و کەل وپەلی کارەبایی و پێداویستیەکانی تری ناوماڵیان لەوێ بە نرخێکی کەم هەڕاج دەکرد.

هەر لەو کاتەدا بیرۆکەیەک بە خەیاڵمدا هات، بۆ کڕینی کراس و پانتۆڵێکی مەدەنی، تاکو بیپۆشم و جارێکی تر بەختی خۆم تاقیبکەمەوەو بچمەوە وەزارەتی بەرگری. چوومە لای لەنگەفرۆشێک، پانتۆڵێکی نیلی و قەمیسێکی شینم بە دینارێک کڕی و گەڕامەوە هۆتێل و لەجیاتی جل وبەرگی سەربازی ئەوانم لەبەرکرد. هەر لە ساڵۆنی هۆتێلەکەش پەنجا فلسم خستە

نـاو تەلەفۆنـە گشـتییەکە، پەیوەندیـم بـە وەزارەتـی بەرگـری کـرد. بگـۆڕی پەیوەندییـە تەلەفۆنیەکـەی وەزارەت وتـی: کێـت دەوێ؟ وتـم: بەڕێوەبـەری گشـتی تەمویـن و نەقـل جەنابـی لیـوا بەکـر وەهیـب ئەلدووریـم دەوێ. وتـی: تـۆ دەیناسـی؟ وتـم: بەڵـێ. وتـی: پێـی بڵێـم کـێ تـۆی دەوێ؟ وتـم: پێـی بڵـێ بەرپرسـی خانـووە گەشـتیارییەکانی هاوینەهـەواری پیرمـام تـۆی دەوێ.

دوای کەمێک وەڵامی دامەوە، وتی: جەنابی لیوا لەگەڵتە.

دوای چـاک و چۆنییێکـی گـەرم، وتـی: تـۆ لەکوێـی، زۆر حەزدەکـەم بتبینـم. منیـش وتـم: هاتوومەتـە بەغـداد، دەمـەوێ چـاوم پێـت بکـەوێ. وتـی: هـەر ئێسـتا وەرە وەزارەتـی بەرگـری، کەسـێک لـە پرسـگە ڕادەسـپێرم بتهێنێتـە لای مـن.

قاچێکـم کردنـە دووان و بـە خێرایـی خـۆم گەیانـدەوە وەزارەتـی بەرگـری، چوومـە لای بەرپرسـی پرسـگەکە و دوای خۆناسـاندن، پێمـوت: پەیوەندیـم بـە لیـوا بەکـر کـردووە، مەوعیـدم لەگەڵـی هەیـە.

بەرپرسـی پرسـگەکە تەماشـای کـردم و بـە سەرسـوڕمانەوە وتـی: تـۆ نەبـووی تۆزێـک پێـش ئێسـتا بـە جـل وبەرگـی سـەربازیەوە هاتیتـە لام؟!

وتم: بەڵێ من بووم.

سـەری خـۆی لەقانـدو هیچـی نـەوت. هـەر لـەو کاتـەدا ئەفسـەرێک بـە پلـەی نەقیـب کـە لـە نزیـک ئێمـەوە دانیشـتبوو، ڕووی تێکـردم، وتـی: تۆزێـک پێـش ئێسـتا تـۆ پەیوەندیـت بـە جەنابـی لیـوا کـرد؟

وتم: بەڵێ .

وتـی: فەرمـوو لەگەڵـم وەرە، جەنابـی لیـوا لـە ژوورەکـەی خـۆی چاوەڕێـت دەکات.

کە چووینە ژوورەوە، لیوا بەکر لەبەرم هەستایەوە و باوەشی پێداکردم، ڕوومەتەکانی ماچکردم و لەسەر کورسییەکی تەنیشت خۆی داینیشاندم و داوای دوو چای ترشی بۆخۆم و خۆی کرد.
ئینجا وتی: چۆنە ڕێگات کەوتۆتە ئێرە؟
وتم: من ئێستا لە بنکەی مەشق و ڕاهێنانی سەربازی کەرکوک سەربازم. هاتوومە لای تۆ تاکو چارەیەکم بۆ بدۆزیتەوەو شتێکم بۆ بکەیت.
کە ئەمەم وت، لیوا دەمێک داما، دوایی وتی: تۆ دەزانی بەقەد کوڕەکانم تۆم خۆشدەوێی؟
وتم: هیچ گومانم لەوە نییە، بۆیە منیش بۆ داواکارییەکی وا قورس هاتوومەتە لات.
ئێمە لەم قسانەدا بووین، بەرپرسی نووسینگەکەی هاتە ژوورەوە وتی: سەرۆکی زانکۆی بەکر بۆ زانستە سەربازییەکان دەیەوێ چاوی پێت کەوێ؟
وتی: با بێتە ژوورەوە.
ئەوەبوو، پیاوێکی باڵابەرز بە جل وبەرگی مەدەنی هاتە ژوورەوە و بە قایمی قاچەکانی لە زەوی دا و دوای خۆناساندن وتی: بە فەرمانی جەنابتان، دوێنێ مارسیدسەکەیان لێوەرگرتوومەتەوە. خۆشت دەزانی بڕبڕەی پشتم تەواو نییە، لەو مارسیدسە ڕاهاتوومە، بۆ تەندروستی من زۆر باشە، بۆیە داوا لە بەڕێزتان دەکەم ڕەزامەندی بفەرموون لەسەر هەڵوەشاندنەوەی ئەو فەرمانە و گەڕاندنەوەی مارسیدسەکە بۆم.
جەنابی لیوا بەکریش داواکاریەکەی پەسندکردو فەرمانی دا بە گەڕاندنەوەی مارسیدسەکە بۆی.
دوای ئەوەی خۆی و خۆم بەتەنها ماینەوە، پێی وتم: وەزیر لە بەرامبەر ژوورەکەمە، ئەگەر داوای تەسریحکردنی تۆی لێبکەم،

زۆری پێخۆش دەبێت و بە ئاسانی بۆمی دەکات، بەڵام مردنم پێخۆشترە نەوەک داوایەکی وای لێبکەم، دەزانی بۆ؟
وتم: بۆ؟
وتی: ئەو وەکو من بە هەوڵ و کۆششی خۆی نەگەیشتۆتە ئەم پلە و پایەی ئێستای، ئەگەر بچمە لای دەبێ بەتوندی قاچەکانمی بۆ لە زەوی بدەم، بەچاوشۆڕی ئەم داوا نایاساییەی لێبکەم.
منیش وتم: بمبوورە نەمزانی وایە، نەدەبوو داوایەکی وا بێمانا لە جەنابتان بکەم، ئێستاش هیچ نەبووە، دەگەڕێمەوە یەکە سەربازیەکەی خۆم و بەرگە دەگرم.
کە ئەمەم وت، سەیری ڕوتبە سەربازیەکەی خۆی کرد وتی: تف لەو ڕوتبە سەربازییە، کەی ئەمە ژیانە کە ئێمەی تیاین!
منیش وتم: بۆچی وا دەڵێی گەورەم؟
وتی: تۆ نازانی ئێمە لە چ ژیانێکی ناخۆشدا دەژین، ژیانی کرێکارێکی پاککەرەوە لە ژیانی ئێمە خۆشترە. تۆش ماوەیەک سەربازی دەکەیت و دەگەڕێیتەوە شوێنی خۆت و لەو بەهەشتە دەژیت کە لێی هاتوویت، بەڵام ئێمە تا پیر دەبین یان دەمرین دەبێ بەم شێوەیە بژین.
ئەمەی وت و ئاوڕێکی لە چایە ترشەکەی بەردەمم دایەوە، بینی وەکو خۆیەتی و هێشتان نەمخواردۆتەوە، وتی: چایەکەت بخۆوە تاکو سارد نەبۆتەوە، دڵ لە دڵ مەدە، شتێکت هەر بۆدەکەم، لێناگەڕێم بە نائومێدی بگەڕێیتەوە.
تا من چایە ترشەکەم خواردەوە، لیوا بەکر بێریەکەی لەسەری نا و لە پشت مێزەکەی هاتە دەرەوەو وتی: دەچین بۆلای بەڕێوەبەری گشتی تەجنیدی سەربازی، من و ئە و دەرچووی یەک خولی ئەفسەرانین، هەردووکیشمان بە هەقی خۆمان

گەیشـتووینەتە ئـەم پلـە و پایەیـە. داوا لـەو بکـەم یارمەتیمـان بـدات، باشـترە لـەوەی تەنـازول بـۆ وەزیـر بکـەم، ئـە و بـە خاتـرو خاترانـە ئـە و پلـە و پایـەی وەرگرتـووە.
بەمشـێوەیە، مـن و جەنابـی لیـوا سـواری مارسیدسـە ڕەشـەکە بوویـن و لـە دەرگای سـەرەکی وەزارەت چووینـە دەرەوە. لـەو چرکەیـەدا بزەیـەک هاتـە سـەرلێوەکانم، لەبیـری خۆمـا وتـم (دونیایەکـی سـەیرە، چەنـد ڕۆژێـک پێـش ئێسـتا لـە بنکـەی مەشقکردن سزایان دام و لەسەر زگ ڕایانکێشام، کەچی ئێستاش لـە دەرگای سـەرەکی وەزارەتـی بەرگـری سـڵاوی سـەربازیمان بۆدەکـەن).
دوای تۆزێـک گەیشـتینە بەڕێوەبەرێتـی گشـتی تەجنیـدی سـەربازی لـە بابولموعـەزەم لـە نزیـک پەیمانـگای تەکنیکـی ڕەسـافە.
بەڕێوەبـەری گشـتی تەجنیـد پلـەی سـەربازی لیـوا ڕوکـن بـوو، کـە لیـوا بەکـری بینـی، لەبـەری هەسـتایەوەو باوەشـی پێداکـردو تێروپـڕ یەکتریـان مـاچ کـردو پێـی وت: ماوەیەکـی زۆرە یەکتریمـان نەبینیـوە، چـۆن منـت بیرهاتـەوە؟
لیـوا بەکـر وتـی: لەبـەر سـەرقاڵی و کاری سـەربازی کەمتەرخـەم بـووم نەمتوانـی بتبینـم.
دوای ئـەوەی کـە دانیشـتن، بەڕێوەبـەری گشـتی تەجنیـد وتـی: ئـەم گەنجـە کێیـە لەگەڵتـە؟
وتـی: ئـەم گەنجە بەرپرسـی خانـووە گەشـتیارییەکانی هاوینەهـەواری پیرمـام بـوو لـە باکـور، ماوەیـەک پێـش ئێسـتا پشـووێکی دوو هەفتەییـم وەرگـرت و دوای زیاتـر لـە دە سـاڵ کـە باکـورم نەبینیبـوو، چوومـە ئـەوێ و دوو هەفتـە لـە هاوینەهـەواری پیرمـام لای ئـەو گەنجـە مامـەوە.
لـە درێـژەی قسـەکانیدا وتـی: خـۆت دەزانـی گەشـتکردنی ئێمـە

بــۆ باکــور ئاســایی نییــه، زۆر مەترســیدارە، لەبــەر ئــەو بــارە نائاســاییيەی باکــوری تیایــە. پێــش ئــەوەی بچمــە ئــەوێ، لــە وەزارەت منیــان زۆر ترســاند، وتیــان ئــەوێ شــەڕی تیایــە، بــۆ ســەلامەتی ژیانــت بــاش نییــە. بــەڵام مــن گوێــم پێنــەدان و بــە ناســنامەیەکی جیــاواز چوومــە ئــەوێ. بــەڵام وێــڕای ئــەو کــوڕە بــە پلــە ســەربازیە ڕاســتەقینەکەمی دەزانــی، لــە خانووێکــی ئاســایی نیشــتەجێ کــردم و زەمانەتــی ســەلامەتی ژیانیشــی کــردم، وای کــرد بــۆ مــاوەی دوو هەفتــە بــە ئاســوودەیی بژیــم. ئێســتاش بۆتــە ســەربازو دەیــەوێ شــتێکی بــۆ بکــەم.

بەڕێوەبــەری گشــتی تەجنیــد ڕووی لەمــن کــرد وتــی: ئەگــەر دەفتــەری خدمــەت لەلایــە هــەر ئێســتا تەسـریحت دەکــەم.

منیــش وتــم: گــەورەم دەفتــەر خدمــەم هەڵنەگرتــووە، لــە ماڵەوەیــە، ماڵیشــمان لــە هەولێــرە.

وتــی: کێشــە نییــە، هــەر ئەمــڕۆ بگەڕێــوە شــاری هەولێــرو بەیانــی دەفتەرخدمەکەتــم بــۆ بێنــە، لەبــەر خاتــری لیــوا بەکــر تەســریحت دەکــەم.

دوای ئــەوەی چایەمــان خــواردەوەو هــەردوو لیــوا هەندێــک بیرەوەریــی خۆیــان بۆیەکتــری گێڕایــەوە، هەســتاین، هەتــا بــەر دەرگا لەگــەڵ لیــوا بەکــر بــووم، دوایــی ئــەو ســواری مارسیدســەکەی بــوو، گەڕایــەوە وەزارەتــی بەرگــری، منیــش تاکســییێکم گــرت و گەڕامــەوە هۆتێــل نــزار. زۆر دوودڵ بــووم، لەبیــری خۆمــدا دەمــوت (تــا دەگەڕێمــەوە هەولێــر و جارێکــی تــر دەگەڕێمــەوە بەغــداد لەوانەیــە بەهــۆی غیاباتــەوە داخیلــی هــرووب بــم) بۆیــە بڕیــارم دا لەجیاتــی ماڵــەوە بگەڕێمــەوە ســەربازگە، پێنــج شــەممە دوای مەشــقکردن بگەڕێمــەوە هەولێــر، ئینجــا دەفتــەر خدمەکەمــی بــۆ ببــەم.

بـەم شـێوەیە گەڕامـەوە شـاری کەرکـوک، کـە ڕەئیـس عورەفـا شـێرکۆ چـاوی پێـم کـەوت، هـەر لـە دوورەوە بەدەنگـی بـەرز هـاواری کـرد وتـی: دادو بێـداد لەدەسـت تـۆ ئەبـو شـوارب، نازانـم کـەی فێـرە نیـزام دەبیـت و لـە سـەرپێچییەکانت ڕزگارم دەبێـت. واپێدەچـوو، ڕەئیـس عورەفـا شـێرکۆ غیاباتـی منـی تۆمـار نەکردبێـت، بۆیـە لـە پرتـە و بۆڵـە بـەولاوە هیـچ کاردانەوەیەکـی تـری نەبـوو.

تاکـو ڕۆژی پێنجشـەممە لەبنکـەی مەشـقی سـەربازی مامـەوەو دوایـی لـە دوای دەوام دابەزیـم و گەڕامـەوە ماڵـی خۆمـان لـە شـاری هەولێـر. باوکـم کـە منـی بینـی، وەکـو جارانـی پێشـوو، سەرزەنشـتی کـردم وتـی: هیـچ سـەربازی وەکـو تـۆم نەبینیـوە، هێنـدە جـرت و فـرت دەکەیـت، وەختـە گومانـت لێبکـەم کـە سـەربازیت.

منیـش سـوێندم بـۆی خـوارد، پێـم وت: بەخـوا ڕامنەکـردووە، هـەر ئێسـتا لـە بنکـەی مەشـقی سـەربازی گەڕاومەتـەوە. واسیدەیەکیشـم کـردووە بەیەکجـاری لـە سـەربازی تەسـریح دەبـم.

کـە ئەمـەم وت، جرتێکـی گـەورەی کێشـا وتـی: ترحێـو، بـۆ سـەربازی یـاری منداڵانـە بـە ئـارەزووی خـۆت ڕزگارت بێـت.

منیـش بەدرێـژی چیرۆکەکـەم بـۆی گێڕایـەوەو پێـم وت: بەیانـی جارێکـی تـر دەگەڕێمـەوە بەغـداد، دەفتـەر خدمەکـەم دەبەمـە لای بەڕێوەبـەری گشـتی تەجنیـد و تەسـریح دەبـم.

ئـەو ڕۆژە زۆر دڵخـۆش بـووم، پیاسـەیەکی نـاو بـازاڕم کـردو بـەدەوری قەڵاتـدا سـووڕامەوە، دوایـی بەنـاو دوکانەکانـی شـێخەڵلا و پـردی سـەیداوە یاغـر یاغـر ڕۆیشـتم تـا گەیشـتمەوە گەڕەکەکـەی خۆمـان. لەنزیـک ماڵـی خۆمـان قارەمـان قولـی و قارەمـان قشـپلم بینـی، سـڵاوم لێکـردن و یەکتریمـان ماچکـرد. لـە ئەحواڵـی زیـاد

مەندۆم پرسی، قارەمان قولی وتی: نەتزانیوە ئەویش بۆتە سەربازو ڕەوانەی سەربازگەی ڕەشید کراوە لە بەغداد؟
وتم: بەیانی دەچمە بەغدادو لەوێ سەردانی دەکەم. وتی: بۆچی دەچیتە بەغداد، خۆ تۆ لە لەوێ سەرباز نیت؟
وتم: نەخێر، بەڵام ڕۆژی شەممە دەچمە بەغداد بۆ تەواوکردنی معامەلەی تەسریح بوونم.
قارەمان قشپل جرتێکی کێشا وتی: هەمووی چەند مانگێکە تۆ چوویتە سەربازی، دەبێ سێ ساڵ عەرەبانەکەت ڕابکێشی، خۆ یاری منداڵان نییە.
بەهەرحاڵ، ئەم شەوو ڕۆژەم لەگەڵ خانەوادەکەم و هاوڕێکانم بەسەربردو بەیانیش زوو هێشتان ڕۆژ هەڵنەهاتبوو چوومە گەراج و بە سواری پاسێکی بیست و یەک نەفەری بەرەو شاری بەغداد بەڕێکەوتم.
کە گەیشتینە جێ، لەبەردەم گەراجی نەهزە تاکسییێکم ڕاگرت، بە نیو دینار منی بردە بەردەم دایەرەی تەجنیدی گشتی.
چوومە پرسگە داوای بینینی بەڕێوەبەری گشتیم کرد. بەرپرسی پرسگەکە وتی: تۆ دەیناسی؟
وتم: بەڵێ، لەسەر داوای خۆی هاتوومەتە لای، پێی بڵێ هاوڕێکەی لیوا بەکرە دەیەوێ بتبینێ.
بەرپرسی پرسگە تەلەفۆنەکەی هەڵگرت و قسەی لەگەڵ بەڕێوەبەری گشتی تەجنید کرد. دوایی تەلەفۆنەکەی دانا و باجێکی دامێ و پێی وتم: تۆ ژوورەکەی پێدەزانیت؟ وتم: بەڵێ جارێکی تر بۆلای چوومە.
وتی: کەواتە پێویست ناکات کەست لەگەڵ بنێرم.
ئەوەبوو چوومە لای بەڕێوەبەری نووسینگەکەی و داوای دیداری جەنابی لیوام کرد. ئەویش تەلەفۆنەکەی هەڵگرت و بە لیوای

وت (کەسێک هاتووەو دەیەوێ بتبینێ، دەڵێ پێشتر هاتوومەتە لای و دەیناسم).
دیاربوو جەنابی لیوا دوودڵ بوو لە ناسینم بەڵام ڕێگاشی دا کە بیبینم. کە چوومە ژوورەوە، چاوم بە ئەفسەرێکی سووروو سپی باڵابەرز کەوت، ئەو کەسە نەبوو کە پێشتر بینیبووم. سڵاوم لێیکرد، سڵاوەکەی لێوەرگرتمەوە وتی: خۆتم پێبناسێنە، لەوە ناچێ پێشتر یەکتریمان بینیبێت؟
لە خەفەتان هیچ قسەیەکم پێنەکرا. بەڕێوەبەری گشتی تەجنید هەستی پێکرد کە ڕەنگم تێکچووە، بۆیە لە پشتی مێزەکەی هاتە دەرەوەو دەستی خستە سەر شانم وتی: کوڕم دەزانم تۆ بۆلای بەڕێوەبەری گشتی پێشوو هاتووی، بۆیە بە بینینی من سەرت سوڕما.
وتم: ڕاستە، هەفتەی ڕابردوو لەگەڵ لیوا بەکر هاتینە ئێرە، کەسێکی تری لێبوو، داوای لێبووردنت لێدەکەم، ئاگاداری هیچ شتێک نیم.
وتی: کوڕم پێم بڵێ داواکاریت چییە تاکو بۆتی بکەم؟
وتم: هیچ داواکارییێکم نیە، تەنها ویستم سڵاوی لێبکەم. بەڵام دەکرێ بپرسم ئێستا ئەو لەکوێیە؟
وتی: بەداخەوە بە بڕیاری ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش خانەنشین کراوە.
زۆرم پێناخۆش بوو، خانەنشینبوونی ئەو، بۆمن گورزێکی کوشندە بوو، ئەو تاکە ئومێدەش کە هەمبوو بۆ تەسریح بوونم لەدەستم چوو.
بەم شێوەیە بە خەفەتەوە گەڕامەوە گەراج و جارێکی تر گەڕامەوە شاری کەرکوک و چوومەوە بنکەی مەشق و ڕاهێنان بۆلای ڕەئیس عورەفا شێرکۆ. بەقەد جوونێک لێی پاڕامەوە

هەتا غیابی ئەو ڕۆژەی بۆ ڕەشکردمەوە.
لەگەڵ چارەنووس هیچ ناکرێت، ئەگەر بێبەختیم نەبا، بۆچی بەڕێوەبەری گشتی تەجنید لەو کاتە لە پۆستەکەی دوور دەخرایەوە. ئەو دەرفەتە زێڕینەم لەدەست چوو، لەبیری خۆمدا دەموت ( لەوانەیە جارێکی تر دەرفەتی وەهام بۆ دووبارە نەبێتەوە).
بەهەرحاڵ، بڕیارم دا دان بەخۆمدا بگرم و پابەندی مەشق و ڕاهێنان بم، پەیوەندیشم لەگەڵ ڕەئیس عورەفا شێرکۆ زیاتر خۆشکەم.
زۆربەی سەربازەکان بەسەر سەربازگەکاندا دابەشکرابوون، چەند سەربازێکی کەم لەوێ مابووینەوە، بەم دواییەش ڕەئیس عورەفا وەکو هاوڕێی لێهاتبوو، زۆر ماندووی نەدەکردین، زۆربەی کاتەکانی لەگەڵمان بە گێڕانەوەی نوکتەو قسەی خۆش بەسەردەبرد.
هێندەی پێنەچوو، ڕۆژێک لە ساحەی عەرەزات وەستابووم، نائیب زابتی قەڵەم هاتە لام، نووسراوێکی دامێ و پێی وتم: ئەبو خەلیل ئەمە فەرمانی گواستنەوەتە بۆ نەخۆشخانەی سەربازی سلێمانی. هەر ئێستا بڕۆ کەلوپەلەکانت کۆبکەوەو پەیوەندی بەو شوێنەوە بکە.
کە نووسراوەکەم وەرگرت، لە خۆشییان قاچەکانم زەوییان نەدەگرت، زۆرم پێخۆش بوو کە بۆ شارێکی کوردستان گواستراومەتەوە، تەنانەت کارکردنیشم لە نەخۆشخانەی سەربازی زۆر پێخۆشبوو.
بە خێرایی خۆم گەیاندەوە هۆڵی خەوتن و کەلوپەلەکانم خستە ناو جانتاکەمەوە و چوومە بەردەم بابولنیزام. هەر لە دوورەوە شوفێری تاکسییەک بانگی کردم، وتی: ئەبوخەلیل

ئەگـەر دەچیتــە گـەراج لەگـەڵ مــن وەرە، سـەرەی منــە.
جانتاکـەم خسـتە نـاو سـندووقی سـەیارەکە و خۆشـم لەپێشـەوە دانیشـتم، بـەرەو گەراجـی شـاری سـلێمانی بەڕێکەوتیـن.
تـا گەیشـتمە شـاری سـلێمانی نیـوەڕۆ داهـات، زۆر برسـیم بـوو، بۆیـە لامدایـە چێشـتخانەیەک، دوو قـاپ برنـج و شـلەی فاسـولیام داواکـرد، لەگـەڵ دوو نانـی گـەرم خـواردم. ئینجـا بەسـواری تەکسـیێک چوومـە نەخۆشـخانەی سـەربازی، نووسـراوەکەم بـردە قەڵەمـی نەخۆشـخانە. دوای تۆزێـک چاوەڕوانـی، ئینزباتێـک هاتـە لام وتـی: ئەبوخەلیـل وەرە ژوورەوە ئامیـر تـۆی دەوێ.
کـە چومـە ژوورەوە، سـڵاوی سـەربازیم لێکـرد، وتـم: گـەورەم فەرمانتـە؟
وتی: کوڕم تۆ خەڵکی کوێی؟
وتم: خەڵکی شاری هەولێرم.
وتـی: وەحدەیەکـی سـەربازیمان لەسـەر ڕێـگای دووکان لـە گونـدی قلیاسـان هەیـە، دەتنێرمـە ئـەوێ. بۆتـۆ زۆر بـاش دەبـێ، لەشـاری هەولێـر نزیـک دەبیتـەوەو شوێنەکەشـی زۆر خۆشـە و خەڵکـی ئـەو ناوچەیـەش کەسـانی باشـن، ئاووهەوایەکـی زۆر سـاف و بێگەردیشـی هەیـە، لـەوێ زۆر مورتـاح دەبیـت.
ئەمـەی وت و نووسـراوێکی دایـە دەسـتم وتـی: ئەمـە فەرمانـی گواسـتنەوەتە بـۆ وەحـدەی پزیشـکی قلیاسـان.
بـەو شـێوەیە، هاتمـە دەرەوە، چوومـە گـەراج و لەوێشـەوە بـە قەمەرەییـک بـە ڕێـگای کۆیـە و هەولێـر چوومـە ئـەوێ.
گونـدی قلیاسـان لـە شـاری سـلێمانی زۆر دوور نەبـوو، کـە گەیشـتینە ئـەوێ، شـوفێرەکە ئوتومبێلەکـەی بـۆ ڕاگرتـم، بەدەسـت ئیشـارەتی بـۆ گوندێکـی بچکۆڵانـە کـرد، تەنهـا یـەک کیلۆمەتـر لەڕێگاکـەوە دووربـوو، وتـی: ئـەم گونـدەی دەیبینـی قلیاسـانە و ئـەو وەحـدە

سەربازیەش کە لێی نزیکە، ئەو شوێنەیە کە تۆ مەبەستتە.
وەرزی زستان بوو، لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٨ بووین، باران نم نم دەباری و ئاوی باران بە و دەشت و کێوانە جۆگەلەیان بەستبوو، کەش و هەوایەکی سارد بوو. بەدەم جۆگەلەی ئاوەکە بەرەو بارەگای وەحدەی مەیدان توبیەکە هەڵکشام. کە گەیشتمە ئەوێ، هەندێک سەربازی عەرەب هاتنە پێشوازیم وتیان: واپێدەچێت تۆش بۆ ئێرە گواسترابیتەوە؟
وتم: بەڵێ.
وتیان: ئێرە شوێنێکی زۆر خۆشەو هەست بە بێزاری ناکەیت، چونکە ڕۆژانە تەنها دوو کاتژمێر مەشق دەکەین. کاتەکانی تر هەر کەس و بە ئیش وکاری خۆی خەریک دەبێت.
کە گەیشتینە جێ، بە عەریفی قەڵەمی وەحدەیان وت: ئەم سەربازە بۆ وەحدەکەمان گواستراوەتەوە.
ئەویش نووسراوەکەی لێوەرگرتم و بردیە لای ئامیرو هەر بە چاوترووکانێک گەڕایەوە لامان وتی: لەگەڵ خۆتان بیبەن بۆ کۆگا با بەتانی و بالیف و پێداویستیەکانی تر وەربگرێت. دواییش بیبەنە لای عەریف فەسیل و ناوی لای ئەو تۆمار بکەن.
قلیاسان شوێنێکی زۆر خۆشبوو، ئاووهەوایەکی سازگارو سروشتێکی دڵڕفێنی هەبوو، بەیانیان دەنگی قاسپەی کەو لەگەڵ خوڕەی ئاو و شنەی با تێکەڵ بەیەک دەبوون. هەرچەندە زۆربەی سەربازەکانی ئەم وەحدەیە بەڕەگەز عەرەب بوون، بەڵام کەسی باش بوون. ماوەیەک لەوێ مامەوە، هیچ هەستم بە غەریبی نەدەکرد، بەیانیان پێش ئەوەی خۆر هەڵبێت بۆ ماوەی دوو کاتژمێر مەشقیان پێدەکردین، دوای ئەوە هەرکەس دەچووە سەر ئیش وکاری خۆی. خوێندەوارەکان بۆ قەڵەمی

وەحـــدە و چێشـــتلێنەرەکانیش بـــۆ چێشـــتخانە و هەندێکیـــش بـــۆ کۆگا، یاریدەدەری پزیشک و برینپێچەکانیش لەگەڵ بەردەستەکان دەچوونە شوێنی چارەسەرکردنی نەخۆش و دەرمانخانە. ئەوانی تریش بەشێکیان بۆ ئیشکردن و پاسەوانی بەندیخانە و دەوریە دەرۆیشتن.

لەو وەحدەیە زۆر نەمامەوەو جارێکی تر بۆ وەحدەیەکی پزیشکی مەیدانی لە کارێزەوشکە گواسترامەوە.

کارێزەوشکە لە دەرەوەی شاری سلێمانی بوو، بەڵام زۆریش لە شارەکە دوور نەبوو، بۆیە ئەو سەربازەی خەڵکی شار بوو، یان کەسوکاری لەوێ بوو، دوای نانخواردنی نیوەڕۆ ڕێگایان پێدەدا بچێتەوە لای خانەوادەکەی. منیش ئەم هەلەم قۆستەوە، هەر لەیەکەم ڕۆژ وتم ماڵی مامم لەم شارەیە، ئەوانیش داوایان لێکردم پشتگیرییێکی موختاری گەڕەکەکەیان بۆ بێنم.

هەر ئەو ڕۆژە ئامیری وەحدەکەمان وەرەقەیەکی عەدەم تەعەروزی دامێ وتی: دوای نیوەڕۆ دەتوانی دابەزیت، دەبێ بۆ بەیانی پشتگیری موختارت پێبێت، دەنا هیچیتر ڕێگات پێنادەین دابەزیت.

دوای نیوەڕۆ، پاش ئەوەی نانی نیوەڕۆم لەگەڵ سەربازەکان خوارد، چوومە سەر شەقامەکە و لەگەڵ پاسێکی نەفەرات کە لە نێوان کارێزەوشکە و شاری سلێمانی ئیشی دەکرد، ڕۆیشتم، سەرەتا چوومە مزگەوتی کاک ئەحمەدی شێخ جلە سەربازیەکانم داکەندو جلی مەدەنیم لەناو جانتاکەم دەرهێنا و پۆشیم.

مزگەوتەکە مجێورێکی پیرەمێردی هەبوو، زۆر دەستکورت دیار بوو، بۆیە هەندێک خورما و خواردنی قوتووم لە جانتاکەم دەرهێنا و پێمدا. مجێورەکە زۆر کەیفی هات وتی: کوڕم تا

مـن لێرەبـم، هیـچ شـەرم مەکـە و دڵ لـە دڵ مـەدە، هەرکاتێـک ویسـتت لێـرە جلەکانـت بگـۆڕە، منیـش سـەربازیم کـردووەو لێـت تێدەگـەم کـە لـە ترسـی ئینزباتـەکان دەتـەوێ خـۆت بگۆڕیـت نـەوەک سـزات بـدەن.

گەلێـک سوپاسـگوزاری بـووم، دوای خۆگۆڕینـم چوومـە شـوێنی نووسـینگەی موختـارەکان. هـەر لـەوێ خۆمکـرد بـە ژووری نووسـینگەی موختـاری گەڕەکـی بەختیـاری، دوای سـڵاوکردن، بـە موختارەکـەم وت: مـن خەڵکـی شـاری هەولێـرم، لـە کارێزەوشـکە سـەربازم، ماڵـی مامـم لـە گەڕەکی بەختیارییـە، هاتـووم پشـتگیریم بدەیتـێ تاکـو بیدەمـە ئامیـری وەحدەکەمـان بۆئـەوەی بتوانـم ڕۆژانـە دابـەزم.

موختارەکە وتی: ژمارەی خانووەکەیان دەزانی؟

وتم: نەخێر.

وتـی: کەواتـە لەگەڵـم وەرە بـە تەکسـیێک دەچینـە ئـەوێ، دوای دڵنیابـوون لـە ماڵەکەیـان، پشـتگیریت دەکـەم.

ئیتـر ئەوەبوو هەردووکمـان بە سـواری تەکسـیێک چووینـە گەڕەکی بەختیـاری. لەڕێـگا بیـرم لەوەدەکـردەوە کـە چـۆن موختـار فریـو بـدەم و ئـەو پشـتگیریەی لـێ وەدەسـت بێنـم.

کـە گەیشـتینە گەڕەکـی بەختیـاری، چووینـە بـەردەم ماڵـی خاڵـە عەبـدە. خاڵـە عەبـدە لـە شـارۆچکەی دەربەندیخـان دراوسـێمان بـوو. دوو ژنـی هەبـوو، ژنـە گەورەکـەی نـاوی ئامەخـان بـوو، ماڵیـان لـە گەڕەکـی قەرەجـاوە بـوو لـە شـاری سـلێمانی، ژنـی دووەمیشـی نـاوی شەمسـەخان بـوو، لـە شـارۆچکەی دەربەندیخـان لەگەڵـی دادەنیشـت. بـەڵام دوای مردنـی خاڵـە عەبدە شەمسـەخان بـە خـۆی و منداڵەکانـی دەگەڕێتـەوە شـاری سـلێمانی و لـە گەڕەکـی بەختیـاری نیشـتەجێ دەبێـت.

جـا کـه گەیشـتینه ماڵـی شەمسـەخان، بـە شـوفێری تەکسـییەکەم وت: ڕابگـره تـا دەچـم ژمـارەی دەرگای ماڵـی مامـم بـۆ موختـار دەهێنـم.

کـه ئەمـەم وت، موختـار وتـی: هـەر ئەوەنـدە بـەس نییـە، دەبـێ خۆشم لـه وە دڵنیابـم کـه ئـەوە ماڵـی مامتـە، ئینجا پشـتگیرییەکەت بـۆ دەکـەم.

منیـش وتـم: تـۆش هەقـی خۆتـە و بەرپرسـیارێتی شـتێکی گەورەیـە، بەتایبەتـی پشـتگیری سـەربازێک لـەم ڕۆژەدا گاڵتەنییـە. بـەڵام تـۆ لەنـاو تەکسـییەکە چـاوەڕێ بکـە تاکـو خەبەریـان پێـدەدەم نـەوەک لـە بارودۆخێکـی نەشـیاوبن.

موختاریش وتی: باشه کوڕی خۆم، بەڵام زۆر دوامەکەوە.

ژمـارەی خانووەکـەم لـە پارچـە کاغەزێـک نووسـییەوە، ئینجـا زەنگـم لێـدا. گوڵیـزار کچـی شەمسـەخان هاتـە دەرەوە، کـە چـاوی بـە مـن کـەوت، پێشـوازییێکی گـەرم و گـوڕی لـێ کـردم وتـی: ئـەوە چۆنـە ڕێـگات کەوتۆتـە ئێـرە، ئێسـتا دایکـم چـاوی پێـت بکـەوێ، لـە خۆشـیان بـاڵ دەگرێـت.

منیـش وتـم: مـن ئێسـتا لـە کارێـزە وشـکە سـەربازم و لەگـەڵ موختـاری گەڕەکەکەمـان هاتـووم، دەیـەوێ لـە وە دڵنیـا بێـت کـە ئێـوە دەناسـم. مـن لای ئـەو وتومـە ئـەوە ماڵـی ماممـە، تاکـو پشـتگیریم بـۆ بـکات، بـۆ ئـەوەی لـە وەحدەکـەم ڕێـگام پـێ بـدەن ڕۆژانـە دوای نیـوەڕۆ داببـەزم.

ئەویش وتی: ئەگەر دابەزیت لە کوێ دەخەویت؟

وتم: لە هۆتێل ژوورێکم گرتووە، لەوێ دا دەبەزم.

وتی: ئەی بۆ نەهاتیتە ماڵی ئێمە؟

وتـم: ئـەو هۆتێلـە لـە نـاو جەرگـەی بازاڕەکەیـە، پاسـەکانی کارێـزە وشـکە لـە نزیـک ئـەو لـە بـەردەم مزگەوتـی کاک ئەحمـەدی شـێخ

دەوەستن. بۆ من وا باشترە بەیانیان زوو بە بێ دواکەوتن دەچمە وەحدەکەمان.
کە موختار ئێمەی بەو شێوەیە بینی، بانگی کردم وتی: ئێستا دڵنیا بووم کە ئەوە ماڵی مامتە، ژمارەی سەر دەگایەکەم بۆ بێنە، پێویست ناکات لە ئوتومبێلەکە بێمە خوارەوە.
منیش پارچە کاغەزەکەم لە گیرفانم دەرهێنا و دامە دەستی و پێم وت: ئەمەش ژمارەی خانووەکەیانە.
لێی وەرگرتم وتی: با بگەڕێینەوە نووسینگەکەم ئەوسا پشتگیرییەکەت بۆ دەکەم.
بەم شێوەیە، لەگەڵ موختار گەڕاینەوە نووسینگەکەی و پشتگیرییەکەی بۆ کردم و مۆری خۆشی لێدا و دایە دەستم وتی: کوڕەکەم بمبوورە کە ئەزیەتمدایت، خۆت دەزانی ئیش وکاری ئێمە بەرپرسیارێتی زۆرەو حکومەتیش هەموو کات چاوی لەسەرمانە، ئەگەر سەرپێچییێکمان لێ ببینێت لەکارەکەمان دوورمان دەخاتەوە.
پشتگیرییەکەی موختارم خستە گیرفانم و چوومە هۆتێل دڵشاد. ژوورێکی یەک قەرەوێڵەییم بە کرێی مانگانە بە سی دینار گرت. لەخۆشییان وەخت بوو بفڕم، لەبیری خۆم دەموت (لەمەودوا هەموو ڕۆژێک دوای نیوەڕۆ دەچمە سەرچنارو ئاوهەوایەکی بێگەرد هەڵدەمژم و چاویشم بە دووکەس دەکەوێ).
بەیانی زوو لەخەو هەستام، لە چایخانەکەی بەردەم هۆتێلەکە نان و ماستم بە چای گەرم خواردو دواییش بە پاسی کارێزەوشکە چوومە وەحدەکەمان. پێش ئەوەی بچمە ساحەی عەرەزات، پشتگیرییەکەم بردە قەڵەمی وەحدە.
دوای سەعات دە لە مەشق و ڕاهێنان گەڕاینەوە هۆڵەکانمان بۆ پشوودانێکی کورت، دواییش هەریەکەمان چووینە سەر ئیش وکاری خۆمان.

هێشـتان هیـچ شـوێنێکم بـۆ تەرخـان نەکرابـوو، هـەر ئـەو ڕۆژە ئامیـر بەدوایـدا نـاردم وتـی: کـوڕم مـادام تـۆ ناوەندیـت تـەواو کـردووە لـە قەڵەمـی وەحـدەت دادەنێـم، ئـەو پشتگیریەشـم بینـی کـە دابووتـە قەڵـەم، ڕەزامەندیـم بۆکردیـت کـە لەمـەودوا ڕۆژانـە دوای دەوامـی فەرمـی دابەزیـت، تەنیـا ئـەو ڕۆژانـە نەبێـت کـە نـۆرەی ئێشـکگریت دەبێـت.

ئامـری وەحدەکەمـان خەڵکـی شـاری موسـڵ بـوو، کەسـێکی زۆر سـادەو سـاکار بـوو. زوو زوو بەسـەری دەکردینـەوەو گاڵتەوگەپـی لەگـەڵ دەکردیـن. زۆر حـەزی لـە بەخێوکردنـی باڵنـدە بـوو. منیـش ئـەوەم بـە هـەل قۆستەوەو لای سـەربازەکانی وەحدەکەمـان وتـم: منیـش وەکـو ئامیـر حـەز لـە بەخێوکردنـی باڵنـدە دەکـەم و لەشـاری هەولێـر لـە ماڵـەوە باڵنـدەی جوانـم ڕاگرتـووە.

چەنـد ڕۆژێکـی نەبـرد، قسـەکانم کەوتنـە بەرگوێـی ئامیـرو لـە دوای نـاردم وتـی: بیسـتوومە تـۆش وەکـو مـن ئـارەزووی بەخێوکردنـی باڵنـدەت هەیـە؟

وتم: بەڵێ گەورەم، هەر لە منداڵیەوە خولیای باڵندەم.

وتی: کەوی باشت هەیە؟

وتم: نەخێر بەڵام ئەگەر ئارەزوو بکەیت، دەتوانم بۆت بێنم.

وتـی: نامـەوێ بـۆم بکڕیـت، چونکـە ئەوانـەی لەبـازاڕ دەیانفرۆشـن کـەوی بـاش نیـن.

وتـم: دەزانـم، ئەگـەر تـۆ ڕێـگام پێبدەیـت و چەنـد ڕۆژێـک ئیجـازەم پێبدەیـت، دەچمـە شـاخی قەرەچـووغ، ئـەم شـاخە بـە کـەوی بـاش نـاوی دەرکـردووە، لـەوێ جووتێـک کـەوی باشـت بـۆ ڕاو دەکـەم.

کـە ئەمـەم وت، ئامیـر بـە قسـەکانم دڵخـۆش بـوو، چەکمەجەکـەی بەردەمـی ڕاکێشـا و نموزەجێکـی ئیجـازەی دەرهێنـا و پانـزە ڕۆژ

ئیجـازەی بـۆم نووسـی و دایـە دەسـتم و پێـی وتـم: وابزانـم پانـزە ڕۆژ باشـە بۆئـەوەی بتوانـی لـەو ماوەیـەدا جووتێـک کـەوم بـۆ ڕاو بکەیـت؟

وتـم: ڕاوکردنـی کـەو بەڕێکەوتـە، هەندێـک جـار زوو ڕاو دەکـرێ، جـاری واش هەیـە زۆر لـەو شـاخانە دەمێنینـەوە، لەدواییشـدا بەدەسـتی بەتـاڵ دەگەڕێینـەوە.

ئیجازەکـەم خسـتە گیرفانـم و چوومـە بابولنیـزام، لـەوێ هەندێـک لـە سـەربازەکانی وەحدەکەمـان کـە منیـان بینـی، وتیـان: هەمـوی چەنـد ڕۆژێکـە لـە ئیجـازە گەڕاویتـەوە، بـۆ کـوێ دەچـی؟

وتـم: دەچمـەوە هەولێـر، کـەو بـۆ ئامیـری وەحدەکەمـان ڕاو دەکـەم ئەوجـا دێمـەوە.

کـە گەڕامـەوە ماڵـەوە، ئەمجـارەش وەکـو جارانـی پێشـوو باوکـم هـەر لەبـەر دەرگاوە کـە منـی بینـی بـە دەنگێکـی بـەرز وتـی: نـاکات دیسـان لـە سـەربازی ڕاتکردبێـت؟

منیـش وتـم: ئامیرەکـەم دوو هەفتـە ئیجـازەی پێـداوم تاکـو جووتێـک کـەوی قەرەچووغـی بـۆ ڕاوبکـەم.

کـە وام وت، باوکـم چـاوی چـووە پشـتی سـەریەوەو بـە تووڕەیـی لێـم هاتـە پێشـەوەو تـا دەسـتی گـرت زللەیەکـی تونـدی لەبـن گوێـم دا و وتـی: هەتیـو تـۆ لەکەیـەوە فێـری ئـەم سـاختەچییاتە بوویـت، دەتـەوێ درۆ لەگـەڵ منیـش بکەیـت؟

وتم: بەخوا بە ڕاستیمە، درۆت لەگەڵ ناکەم.

ئیجازەکەم لە گیرفانم دەرهێنا و پیشانم دا.

باوکم کـە ئیجازەکەمـی بینـی، تۆزێـک هێمـن بـۆوەو بە پێکەنینـەوە وتـی: ئێسـتا بـاوەڕت پێدەکـەم کـە تـۆ ئیجـازەت وەرگرتـووە، بـەڵام تێـم بگەیەنـە لەکەیـەوە فێـری ڕاوکردنـی کـەو بوویـت؟

منیـش وتـم: ئـەوە هـەر قسـەیە، بەیانـی دەچمـە بـازاڕی قەیسـەری

و لـه چایخانـەی کەوبـازان جووتێـک کـەوی بـە دوو دینـار بۆدەکـڕم، کـە گەڕامـەوە لەگـەڵ خـۆم بـۆی دەبـەم و پێـی دەڵێـم لـە چیـای قەرەچـووغ بـۆم ڕاو کـردووی.
باوکـم سـەری خـۆی لەقانـدو وتـی: هیـچ سـەرم لێـت دەرناچێـت، ماوەیـەک پێـش ئێسـتا بەپەلـە هاتیتـەوەو دەفتـەری خدمـەت بـرد وتــت لــە وەزارەتــی بەرگــری واسـیدەم کــردووە تەسـریح دەبــم، کەچـی وا دەرنەچـوو.
منیــش وتــم بەختــم نەبــوو، تــا گەڕامــەوە بەڕێوەبــەری گشــتی تەجنیـد لـە کارەکـەی لادرابـوو، بۆیـە ڕیسـەکەم لـێ بـۆوە خـوری و هیچـم بـۆ نەکـرا.
باوکـم ئەقڵـی قسـەکانی منـی نەگـرت، سـەری خـۆی لەقانـدو بەبـێ دەنگـی چـووە دەرەوە.
منیـش جانتاکـەم دانـا و چوومـە گەرماوەکـە دوشـێکم وەرگـرت و خـۆم گـۆڕی و چوومــە بــازاڕی قەیســەری.
لەنـاو قەیسـەری چایخانەیەکـی لێبـوو، خاوەنەکـەی نـاوی محەمـەد چایەچـی بـوو، بـەڵام بـە چایخانـەی کەوبـازان ناوبانگـی دەرکردبـوو، چونکـە کەوبـازەکان و ئـەو کەسـانەی کـە خولیـای کـەون، ڕۆژانـە دەهاتنـە ئـەو چایخانەیـە و لـەوێ شـەڕیان بـە کەوەکانیـان دەکـردو گرەویـان لەسـەردەکردن. جـا کـەو هەبـوو، خاوەنەکـەی بـە هـەزار دینـاری نـەدەدا، کەچـی کاتێـک لـە شـەڕە کـەودا دەدۆڕا، بـە یـەک دینـار هەڕاجـی دەکـرد.
شـتێکی زۆر سـەیر بـوو، لـە خاوەنـی چایخانەکـەم پرسـی بۆچـی ئـەو کـەوە گرانبەهایانـە دوای دۆڕاندنیـان بـە یـەک دینـار دەیانفرۆشـن؟
وتــی: چونکــە جارێکــی تــر بەکەڵکــی شــەڕکردن نایەتــەوە، چــاوی لەبەرامبــەر کــەوەکان دەشــکێت، وەکــو تۆڵەیەکیــش خاوەنەکــەی لــەو بەســتەزمانەی دەکاتــەوە.

داوای چایەکـــی شـــیرینم کـــردو خـــۆم خزانـــدە نـــاو خەڵکەکـــەوە، ســـەیری شـــەڕە کەوەکـــەم دەکـــرد. تاکـــو مـــن چایەکـــەم خـــواردەوە، دوو لـــەو کەوانـــەی کـــە شـــەڕیان دەکـــرد، دۆڕان، خاوەنەکانیشـــیان بەیـــەک دینـــار هەڕاجیانکـــردن.

دەســـــتم بـــــردەوە گیرفانـــــم و پێنـــــج دینـــــارم دەرهێنـــــا، جووتـــــە کەوەکـــــەم کـــــڕی، هـــــەر لەوێـــــش قەفەســـــێکی دوو ژووریـــــم کـــــڕی و هـــــەردوو کەوەکـــــەم خســـــتە نـــــاوی و بـــــەرەو ماڵـــــەوە گەڕامـــــەوە.

قەفەزەکـــەم بـــە کـــەوەوە لـــە کونجێکـــی ژوورەکـــە دانـــا، کاتێـــک باوکـــم هاتـــە ژوورەوەو چـــاوی پێکـــەوت بـــە سەرســـوڕمانەوە وتـــی: دیـــارە کردتـــە ڕاســـتی؟

منیـــش وتـــم: ئـــەی چـــۆن، پێـــم نەوتـــی ئامیرەکەمـــان بۆیـــە ئیجـــازەی داومەتـــێ تاکـــو جووتێـــک کـــەوی بـــۆ ببەمـــەوە.

باوکیشم وتی: ئەو کەوانە بۆچی ناخوێنن؟

وتـــم: ئـــەم جووتـــە کـــەوە لـــە شـــەڕە کـــەودا دۆڕاون و ترســـاون، بۆیـــە تـــا ماوەیـــەک ناخوێنـــن، تاکـــو ترســـیان لەبیـــر دەچێتـــەوە.

ئـــەم دوو هەفتەیـــەم زۆر بەخۆشـــی لەگـــەڵ خانەوادەکـــەم بەســـەربرد، نەمزانـــی ئـــەو ماوەیـــە چـــۆن تەواوبـــوو. دوایـــی بەخـــۆم و جووتـــە کەوەکـــەوە گەڕامـــەوە وەحدەکەمـــان و یەکســـەر چوومـــە لای ئامیرەکەمـــان، دوای ســـڵاوکردن، قەفەســـەکەم لەبەردەمـــی دانـــا و پێـــم وت: گـــەورەم بەخـــت یـــاوەرم بـــوو، دوو ڕۆژ پێـــش تەواوبوونـــی مـــاوەی ئیجازەکـــەم ئـــەم جووتـــە کـــەوە بـــە داوەکـــەوە بـــوون. هەرچەنـــد ئـــەو کەوانەشـــم زۆر بـــەدڵ نیـــن، چونکـــە ئـــەو جـــۆرە نەبـــوون کـــە لەدوایـــان دەگـــەڕام، بـــەڵام پێـــم باشـــتربوو شـــتێکت بـــۆ بێنـــم نـــەوەک بەدەســـتی بەتـــاڵ بگەڕێمـــەوە.

ئامیرەکەمـــان زۆر کەیفـــی هـــات، بانگـــی ســـەربازە خزمەتکارەکـــەی خـــۆی کـــرد پێـــی وت: ئـــەم جووتـــە کـــەوە لـــە ژووری دانیشـــتنەکەم

دابنــێ، زۆر ئــاگات لێیــان بێــت و جــوان بەخێویــان بکــە، ئەگــەر شــتێکیان لێبێــت بەتونــدی ســزات دەدەم.
ڕووی لــە منیــش کــردو پێــی وتــم: تــۆش ئامــۆژگاری ئــەو بکــە و تێــی بگەیەنــە کــە چــۆن بەخێویــان بــکات.
منیــش وتــم: دوایــی زانیارییەکانــی دەدەمــێ، بــەڵام شــتێک هەیــە حەزدەکــەم پێتــی بڵێــم.
وتی: ئەو شتە چییە؟
وتــم: لەبەرئــەوەی ئــەم کەوانــەم تــازە ڕاو کــردووە، بۆیــە لەترســان ناخوێنــن پێویســتییان بــە کاتــە، تاکــو ئــەو ترســەیان لەبیــر دەچێتــەوە. بۆیــە دەبــێ لــەو ماوەیــەدا دەرگای قەفەســەکەیان لــێ نەکرێتــەوە، ئەگینــا لــە شــەقەی بــاڵ دەدەن و دەفــڕن.
کــە ئەمــەم وت، ئامیــر ڕووی لــە ســەربازە خزمەتکارەکــەی کــردو پێــی وت: گوێــت لــێ بــوو چــی وت؟ ئــەم کەوانــە بفــڕن لەجیاتــی ئــەوان دەتخەمــە زیندانــەوە.
دوای چەنــد ڕۆژێــک عەریــف فەســیڵەکەمان پێــی وتــم: خــوا بتگــرێ بــۆ ئــەو چاکەیــەی کــە تــۆ لەگــەڵ ئامیــرت کــردووە!!
منیش وتم: بۆچی چی بووە؟
وتــی: نەتزانیــوە جووتــە کەوەکــەی ئامیــر لەدەســتی ســەربازە خزمەتکارەکــەی فڕیــوە، ئامیریــش ئــەوی گرتــووە؟
وتم: ئەو بەستەزمانە گوناهی چییە؟
وتــی: لەســەر قســەی تــۆ، کاتێــک گوێــی لــە خوێندنــی قاســپەی کــەو دەبــێ، دەرگای قەفەســەکەیان بــۆ دەکاتــەوە، کەوەکانیــش لــە شــەقەی بــاڵ دەدەن و دەفــڕن.
منیش وتم: مادام خوێندوویانە چۆن فڕیون؟
وتــی: ئــەو ســەربازە گوێــی لــە قاســپەی کەوەکانــی ڕادیــۆی کــوردی بــووەو هــەر وای زانیــوە کەوەکانــی ئامیــر دەخوێنــن. بەســتەزمانەی

بەهەڵەداچــووە، دەرگای قەفەســەکەی لێکردوونەتــەوە، ئەوانیــش پوختــە فڕیـون.
کـە ئەمـەم گـوێ لێبـوو، زۆر خەفەتـم بـۆی خـوارد، لـە گرتووخانـە چوومــە لای، لــە ژوورەوە دوو ســەربازی تریشــی لەگــەڵ بــوو، ئــەوان لەســەر غیابــات ســزا درابــوون، ســەربازە خزماتکارەکــەی ئامیریــش لەبــەر فڕینــی کــەوەکان گیرابــوو.
کـە چـاوی بەمـن کـەوت، دەسـتی بـە جوێندانکـرد، گەلێـک جوێنـی پێـدام و دوعـای خراپـی لێکـردم وتـی: خـوا بتگـرێ لەگـەڵ خـۆت و ئـەم بەڵایـە کـە بەسـەرتهێنام.
منیـش بەپێکەنینـەوە پێـم وت: مـن چـی بکـەم، تـۆ بـێ مێشـکی، بۆچـی خوێندنـی کەوەکانـی ڕادیـۆی کـوردی و خوێندنـی ڕاسـتەقینە لـە یەکتـری جیـا ناکەیتـەوە.
وتـی: بەدبەختـی مـن نەبـێ بۆچـی لـەو کاتـەدا پەخشـی ڕادیۆکـە لەسـەر ئێزگـەی کـوردی بەغـداد بـوو؟!
بـۆ دڵدانــەوەی پێمـوت: خەمـت نەبـێ هــەر ئێسـتا دەچمـە لای ئامیـر و بەڵێنـی هێنانـی جووتـە کەوێکـی تـری پێـدەدەم و داواشـی لێدەکـەم کـە بتبەخشـێت و ئـازادت بـکات.
وتــی: ئــەو چاکەیــەم لەگــەڵ مەکــە، بــا هــەر بگیرێـم باشـترە لــەوەی جووتێـک کــەوی تـری بــۆ بێنیــت و بەربدرێـم. ئەمجـارە ئــەوان لەدەســتم شــتێکیان لێبێــت دەمکوژێــت.
وتـم: مەترســە ئەمجـارە جووتــە کەوێکــی وای بــۆ دێنـم، ئەگــەر دەرگای قەفەسەکەشــیان بۆبکەیتــەوە نەفــڕن.
بــەم شــێوەیە، چوومــە لای ئامیرەکەمــان و پێمــوت: گــەورەم خەتـای ئـەو سـەربازە خزمەتـکارەی تیانەبـوو، ئـەو بـە خوێندنـی کەوەکانــی ئێزگــەی کــوردی هەڵخەڵەتــاوەو لێــی تێکچــووە، بۆیــە داوات لێدەکــەم ئەمجــارە ببیەخشــیت. منیــش بەڵێنــت پێــدەدەم

ئەگەر بچمەوە هەولێر جووتە کەوێکی زۆر باشترت بۆ دێنم.
کە ئەمەم وت ئامیرەکەمان زۆر دڵی خۆش بوو، بانگی ئینزباتەکەی بەردەرگای کردو پێی وت: هەر ئێستا بڕۆ ئەو سەربازە خزمەتکارە لە گرتووخانە دەربێنە.
لەو ڕۆژەوە سەربازەکانی وەحدەکەمان بە (ئەبو قەبەچ) بانگیان دەکردم. خزمەتکاری ئامیریش کە منی دەبینی دەیوت: چی بۆ ئامیر دەهێنی بیهێنە، تەنها کەوی بۆ مەهێنە، ئەمجارە بەقسەی تۆ بەریدام، جارێکی تر تۆش لەگەڵ من دەخاتە زیندانەوە.

# بوومه خۆشنووس و نیگارکێشی وەحدەکەمان

دوای ماوەیەک، بەرگوێم کەوت کە زابتی تەوجیهی سیاسی وەحدەکەمان حەزی لە هونەرەو چەند وێنەیەکی هونەرمەندە شێوەکارە جیهانییەکانی لە ژوورەکەی هەڵواسیوە.
ئەمە بۆمن باش بوو، چونکە منیش هونەرمەندی شێوەکار بووم، لە هەمان کاتیشدا قوتابی پۆلی یەکەمی پەیمانگای هونەرە جوانەکان خوێندنی ئێواران بووم لە شاری بەغداد.
بۆیە ئەم هەلەم قۆستەوەو بە بەرگوێی سەربازەکانم خست کە نیگارکێشم و بەشداری پیشانگای هونەریم کردووەو دەیان خەڵاتیشم وەرگرتووەو قوتابیشم لە پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی بەغداد.
دوای ئەوەی ئەم دەنگۆیە لەناو وەحدەکەمان بڵاو بۆوەو گەیشتە بەرگوێی ئەفسەرەکان، نیوەڕۆیەک مولازم غەنی عەبدولنەبی کازم کە ئەفسەری تەوجیهی سیاسی وەحدەکەمان بوو، داوای لێکردم هەندێک تابلۆی هونەری بۆبکەم. منیش داوام لێیکرد کە ڕێگام پێبدات بچمە شاری سلێمانی، بۆیاخ و کەرەستەو پێداویستییەکانی وێنەکردنی بۆبکڕم.
پسوولەیەکی ڕێگاپێدانی بۆ پڕکردمەوە وتی: هەر ئێستا دابەزەو کەرەستەکان بکڕە، تاکو تۆش دێیتەوە شوێنێکت بۆ ئامادەدەکەم لەمەودوا تەنها وێنەمان بۆ بکێشە.
ئەو ڕۆژە لە ڕۆژانی تر زووتر دابەزیم، چوومە ناو شار، گشت پێداویستییەکانم کڕی، دوایی گەڕامەوە هۆتێل، دوشێکم وەرگرت، دوایی تاکو ئێوارە لێی خەوتم.
ئێوارە کە لەخەو هەستامەوە، خۆم گۆڕی و چوومە چایخانەی

شــەعب، دوو نانــی گەرمــم بــە ســەرتووی گامێــش خــوارد، دوو چـای شیرینیشـم لەسـەری فـڕ کـرد. دوایـی چومـە سـینەما دڵشـاد و سـەیری فلیمـی (شـامی کابـوور لـە پاریـس)م کـرد. کاتێـک لـە سـینەما هاتمـە دەرەوە، ئاسـمان تاریـک ببـوو. گەڕامـەوە هوتێـل و تاکـو بەیانـی لەسـەر قەرەوێڵەکـە لێـی خەوتـم.

ئـەم وێنەکێشـانە زۆر بەکەڵکـم هـات، تەنانـەت وای لێهـات، ئامیـری لیــواو قائیــد فرقــەش لەدوایــان دەنــاردم و داوای دروســتکردنی تابلــۆو نەخشــاندنی دار و دیوارەکانــی ســەربازگەیان لێدەکــردم، وەک هومنەرمەنـدی سـەربازگەکەمان ناوبانگـم لەگشـت وەحدەکانـی دەوروپشــتمان پەیداکـرد.

لــەو ڕۆژەوە ئەفســەرەکان مامەڵەیەکــی زۆر جیاوازیــان لەگــەڵ دەکـردم، دەوامـم بکردبـا یـان نەمکردبـا، لێپرسـینەوەیان لەگـەڵ نەدەکـردم و هەرکاتێکیـش ئـارەزووم بکردبـا بـۆ شـار دادەبەزیـم یــان دەچومــەوە هەولێــر بــۆ ســەردانی خانەوادەکــەم.

ئامیرەکەمــان و ئەفســەرەکانی وەحدەکەمــان لەخوایــان دەویســت داوای ئیجازەیــان لێبکــەم، چونکــە ژوورەکانــی هەموویانــم بــە تابلــۆی ڕەنگاوڕەنــگ و دیمەنــی سروشــتی ڕازاندبــۆوە. تەنانــەت ســەربازەکانیش منیــان بــۆ واســیدەی خۆیــان بەکاردەهێنــا و زۆرجــاران هانایــان دەهێنــا بــەر مــن، تاکــو لــەلای ئامیــر پشــتگیرییان بکــەم.

لـە قەڵەمـی وەحـدە نائیـب زابتێکـی زۆر تـووڕەو توندمـان هەبـوو، خەڵکــی شــاری ناســریە بــوو، نــاوی موتەشــەر زیــاب ســاڵح بـوو، کـەس لێـی ڕازی نەبـوو، تەنانـەت لـەو ڕۆژەوەی کـە زانـی ئامیرەکەمــان ڕێــزم دەگرێــت و داواکارییەکانــم جێبەجــێ دەکات، کەوتــە دژایەتیکردنــم و شــەڕی دەروونــی لەگــەڵ دەکــردم.

ئەو کاتەی کە لە بێکاری خەیاڵم بۆ شوێنێکی دوور دەڕۆیشت، دەیوت: (تعال شیل الطابعة).
منیش خەیاڵەکەم دەپچڕاو ئامێری چاپەکەم هەڵدەگرت و لەو شوێنەم دادەنا کە ئەو دەیویست.
دوای تۆزێکی تر کە دەیزانی دووبارە خەیاڵ منی بردۆتەوە، پێی دەوتم: (تعال رجع الطابعه الی مکانها). دەبوو ئامێری چاپکردنەکە بگەڕێنمەوە شوێنی جاران. بەم شێوەیە ڕۆژانە دەیان جار ئەو بەزمەی پێدەکردم.
ڕۆژێک سەربازەکانی قەڵەمی وەحدەکەمان پێیانوتم: هەموومان دەچینە لای ئامیر، داوای لێدەکەین نائیب زابت موتەشەرمان لەکۆڵ بکاتەوە، بۆ شوێنێکی تر بیگوێزێتەوە.
بیرۆکەکەم پێ چاک بوو، منیش لەگەڵیان چوومە لای ئامیر.
سەرەتا عەریف ساڵح ڕووی لە ئامیر کردو پێی وت: گەورەم نائیب زابت موتەشەر بێزاری کردووین، لەگەڵ کەسمان باش نییە، دژایەتی هەموومان دەکات، بۆیە هاتووین داوای گواستنەوەی دەکەین.
ئامیر زۆر تووڕەبوو، دارەکەی دەستی بە هەموو هێزی لە عەریف ساڵح گرت و زۆر جوێنی پیسیشی پێدا، وتی: تۆ درۆ دەکەیت، ئەو سەربازانەت بەزۆری هێناوە، کەسیان گلەییان لەو نییە.
دەری کردە دەرەوە و ڕووی لە سەربازێکی تر کردو پێی وت: تۆ چی دەڵێی؟
ئەویش وتی: گەورەم عەریف ساڵح ڕاست دەکات، ئێمە هەموومان گلەییمان لێی هەیە، هاتووین داوای گۆڕینی دەکەین.
ئامیر هێندەی تر تووڕەبوو، ئەوجارەیان لەپشت مێزەکەی هاتە

دەرەوەو سەربازەکەی دایە بەر شەق و پێلەقە، پێی وت: سەگی سەگباب تۆ کلکی عەریف سالحی بۆیە وادەڵێی دەنا ئەو نائیب زابتێکی باشە، تاکو ئێستا هیچ کەس گلەیی لێنەبووە.
ئەویشی دەرکردە دەرەوەو ڕووی لەمن کرد وتی: ئەی تۆ چی دەڵێی ئەبوشوارب؟
لەبیری خۆمدا وتم (ئەگەر هەمان قسەی ئەوان بکەم، منیش دەداتە بەر شەق و پەیوەندیی نێوانیشمان تێکدەچێت) بۆیە بڕیارم دا قسەی خۆم بگۆڕم، بۆیە وتم: گەورەم تۆ ڕاست دەکەی، من هیچ گلەییم لە نائیب زابت موتەشەر نییە و عەریف سالح پێی نەوتبووم کە بۆ شکایەتکردن ئێمەی هێناوەتە لای تۆ، دەنا لەگەڵیان نەدەهاتم.
کەوام وت، ئامیر زۆر کەیفی هات، دەستی خستە سەر شانم و وتی: بارک اللە.
کە گەڕاینەوە قەڵەم، عەریف سالح هەر پرتەو بۆڵەی بوو، لەبەرخۆیەوە جوێنی بە ئامیر دەدا. منیش لە قاقای پێکەنینم دا. عەریف سالح زۆر تووڕەبوو وتی: تۆ پەیوەندیت لەگەڵ ئامیرو زابتەکان خۆشە و چیت بوێ بۆتی دەکەن، بۆیە بەلاتەوە گرینگ نییە نائیب زابت موتەشەر لێرە بمێنێتەوە یان نا.
منیش وتم: دەزانم نائیب زابت موتەشەر سەگ و سەگبابە، لەئێوەش زیاتر شەڕی دەروونی لەگەڵ من دەکات و ڕۆژێ دەیان جار خەیاڵم دەپچڕێنێ و ئامێری چاپەکەم پێ دەهێنێت و دەبا. بەڵام ئەوە کەی کێشەیە، ئێمە لەوە ڕاهاتووین، هەمووشمان دەزانین کە ئامیر ئەو بەئێمە ناگۆڕێتەوە. هێندەی تریش خراپ بێت، هەر پشتگیری ئەو دەکات، بۆیە پێویست ناکات هیچیتر خۆتانی پێوە خەریک بکەن.

نائیب زابت موتەشەر پیاوێکی کاسەلێس و بەرتیلخۆر بوو، هەرجارێک دابەزیبام، داوای کولیچەو پاقلاوەی لێ دەکردم، پێی دەوتم: تۆ وەکو ئێمە نیت لەماڵی مامت لێت پاڵداوەتەوەو هەرچیت بوێ بۆت دەکەن. بەڵام ئێمە چاومان دەردەچێ بۆ هەندێک کولیچەو پاقلاوەو شیرینەمەنی دەسکردی خۆمانە.
هەرچەند پێم دەوت: حانوتی وەحدەکەمان شیرینەمەنی و هەمووشتێکی تیایە، بۆچی لەوێ نایکڕی؟
ئەو پاساوی دەهێنایەوەو دەیوت: شیرینیەکانی حانوت وەکو شیرینیەکانی ماڵەوە خۆش نین.
هەرچەندە منیش هەر لە دوکانی شیرینەمەنی فرۆشەکان بۆم دەکڕی و بەناوی ماڵی مامم بۆم دەبرد. ئەو هەستی بەوە دەکرد کە لە بازاڕ بۆی دەکڕم، بەڵام خۆی لە گێلی دەدا، هەفتەی جارێک داوای لێدەکردم، تا وای لێهات بێزاری کردم و لە ڕقان زۆرجار لە وەحدەکەمان دەمامەوەو دانەدەبەزیم، چونکە پارەکەم بەشی خەرجی خۆم و کرێی هۆتێل و داواکارییە زۆرەکانی نائیب زابتی نەدەکرد.
لە نیوەی ساڵ نزیک بووینەوە، کاتی ئەزموونەکانی پەیمانگەی هونەرە جوانەکان بوو، چوومە لای مولازم غەنی پێم وت: گەورەم هاتووم داوای ئیجازەت لێدەکەم. دەمەوێ بچمە شاری بەغداد بۆ بەشداریکردنی ئەزموونەکانی پەیمانگەی هونەرە جوانەکان.
کە ئەمەم وت، مولازم غەنی زۆر کەیفی هات، لەمن زیاتر پێی خۆش بوو، وتی: زۆرچاکە نووسراوێکمان لە کۆگاکانی ئەبوغرێب بۆ هاتووە بۆ وەرگرتنی چەک و تەقەمەنی بۆ وەحدەکەمان، بەیەکەوە دەچین و لەجیاتی ئیجازە بۆت دەکەمە مەئمورییە، بەڵام منیش داوایەکم لێت هەیە؟

وتم: فەرمانتە گەورەم.
وتـی: ڕۆژێـک لەگـەڵ خـۆت بمبـە پەیمانـگا و بـە کچەکانـی پۆلەکەتـم بناسـێنە.
وتـم: باشـە گـەورەم، بەیەکـەوە دەچینـە پەیمانـگا و بـە قوتابیـەکان دەڵێـم ئـەوە ئەفسـەری منـە لـە وەحـدەی مەیدانـی پزیشـکی.
بـەم شـێوەیە ڕێککەوتیـن کـە هەریەکەمـان بەتەنیـا بچینـە بەغـداد، کـە گەیشـتینە ئـەوێ، بـۆ ڕۆژی دوایـی پێـش کاتژمێـر دەی سـەرلە بەیانـی لەبـەردەم وێسـتگەی شـەمەندەفەر یەکتـری ببینیـن و ئەوسـا بەیەکـەوە بچینـە ئەبوغرێـب بـۆ وەرگرتنـی چـەک و تەقەمەنییـەکان.
سـەبارەت بـە پلانـی گەشـتەکەمان پێـی وتـم: تەنهـا ڕۆژی یەکـەم و ڕۆژی گەڕانەوەمـان ئیشـم پێتـە.
منیش وتم: چۆن گەورەم؟
وتـی: ڕۆژی یەکـەم بەیەکـەوە دەچینـە ئەبوغرێـب و نووسـراوەکەی خۆمانیـان دەدەینـێ و مامەڵـەی وەرگرتنـی چـەک و تەقەمەنییـەکان جێبەجـێ دەکەیـن، ئینجـا تـا تـۆ ئەزموونەکانـت لـە پەیمانـگا تـەواو دەکەیـت، مـن لـە ماڵـەوە دەمێنمـەوەو تـۆش ئیـش وکارەکانـی خـۆت لـەو ماوەیـە تەواوبکـە، دوایـی تەلەفۆنـم بۆبکـە، جارێکـی تـر لەبـەردەم وێسـتگەی شـەمەندەفەرەکە یەکتـری دەبینینـەوە و بەیەکـەوە دەچینـەوە ئەبوغرێـب بـۆ وەرگرتنـی چـەک و تەقەمەنییـەکان.
بـەم شـێوەیە، هـەر ئـەو ڕۆژە بـە جـل وبەرگـی سـەربازیەوە بـەرەو شـاری بەغـداد بەڕێکەوتـم و دوای نیـوەڕۆ گەیشـتمە جـێ، لـە هۆتێلـی ئەحمـەد لـە مەیـدان دابەزیـم.
بەیانـی پێـش سـەعات هەشـت دابەزیـم، لـە چێشـتخانەی جمهـوری

نیسکێنەم خواردو دوو چای شیرینیشم لەسەری کرد، دواییش چوومە ساحەی مەیدان تاکو بە پاسی گشتی بچمە مەنسوور بۆ بەردەم وێستگەی شەمەندەفەر بۆ بینینی مولازم غەنی.
کە گەیشتمە ساحەی مەیدان، هەر لە دوورەوە ئینزباتێکی سەربازی بانگی کردم و منی خستە ناو زیلێکی سەربازیەوە.
سەرەتا وامزانی ئەوان خۆیان دەمانبەن بۆ ئەو شوێنەی دەمانەوێ. بەڵام کاتێک بینیم هەر سەرباز دەهێنن و دەیانخەنە ناو زیلەکە و کاتیش زۆر درەنگ بوو، ویستم بێمە خوارەوە، یەکێک لە ئینزباتەکان خۆی لێ تووڕە کردم و هەندێک جوێنیشی پێدام.
رووم لە یەکێک لە سەربازە گیراوەکان کردو پێم وت: من بە مەئموریە هاتوومە، مەوعیدم لەگەڵ زابتەکەمان هەیە. بۆچی ئەوانە لێناگەڕێن من بۆخۆم بچم هەتا دوانەکەوم؟
سەربازەکە لە قاقای پێکەنینی دا و بە گاڵتەوە وتی: شتی وا چۆن دەبێ، ئەوان خۆمان دەمانبەن.
ئەقڵم قسەکانی ئەو سەربازەی نەگرت، بۆیە بە سەربازێکی ترم وت: بەڕاستی پێم بڵێن، ئەوانە بۆچی ئێمەیان خستۆتە ناو ئەم زیلەوە؟
سەربازەکە وتی: بزانە چ سەرنجێکیان لەسەرت هەیە، بۆیە تۆیان گرتووە. تۆزێکی تر کە زیلەکە پڕبوو ئەوجا دەمانبەن بۆ ئینزباتخانەی حارسیە و لەوێ دەمانگرن.
هەتا نزیکی نیوەڕۆ ئێمەیان لەناو زیلەکە دەستبەسەر کرد، کە زیلەکە پڕ بوو، ئینجا ئەفسەرێک لە پێشەوەی زیلەکە سوار بوو، دوو ئینزباتیش لە دواوەی زیلەکە لەگەڵ ئێمە سواربوون و ئێمەیان بردە ئینزباتخانەی حارسیە.

دوای ئـەوەی ئێمەیـان ڕیـز کـرد، ئەفسـەرێکی ئینزبـات هاتـە لامـان و یـەک بەیـەک لێمـان وردبـۆوە، نـاو و سـەرپێچییەکانی هـەر یەکێکـی لـە ئێمـە بەجیـا نووسـییەوە. دوای ئەویـش ئەفسـەرێکی تـر هـات وتـی: کـێ لەئێـوە نموزەجـی ئیجـازە یـان نووسـراوی مەئموریـەی هەڵگرتـووە، بێتـە دەرەوە، ئەوانـی تـر لەشـوێنی خۆیـان بمێننـەوە. مـن و چەنـد سـەربازێک کـە نموزەجـی ئیجـازە و نووسـراوی مەئموریەمـان پـێ بـوو، هاتینـە دەرەوە، بەیەکـەوە ڕاوەسـتاین.

ئەفسـەرەکە بانگـی ئینزباتێکـی کـرد وتـی: ئـەو سـەربازانەی کـە هیچیـان پـێ نییـە، بیانخـە گرتووخانـەوە تـا مـاوەی سزاکەیان تـەواو دەکـەن. دوای ئـەوە هاتـە لای ئێمـە و نموزەجـی ئیجازەو نووسـراوی مەئموریەکـەی لـە ئێمـە وەرگـرت و ناونیشـانی وەحدەکەمانـی لەنـاو دەفتەرێـک تۆمـار کـردو پێـی وتیـن: ئێـوە ئـازادن، دەتوانـن بـڕۆن، بەنووسـراوێک ئـاگاداری وەحدەکانتـان دەکەینـەوە بـۆ ئـەو سـەرپێچیانەی کـە کردووتانـە، لـەوێ سـزای خۆتـان وەردەگـرن.

بـەم شـێوەیە مـن و مـولازم غەنـی لەیەکتـری دابڕایـن و نەمانتوانـی یەکتـری ببینیـن. منیـش بەپەلـە خـۆم گەیانـدەوە هۆتێـل ئەحمـەدو جلـە سـەربازیەکانم داکەنـدو جلـی مەدەنیـم لەبەرکـرد، دوای نانخواردنـی نیـوەڕۆ، چوومـە پەیمانـگا و بەشـداری ئەزموونەکانـی نیـوەی سـاڵم کـرد.

دوو هەفتـە لـە شـاری بەغـداد مامـەوەو تاقیکردنـەوەی نیـوەی سـاڵم ئەنجامـدا. هـەر لـەو ماوەیەشـدا چومـە سـەربازگەی ڕەشـید، چـاوم بـە زیـاد مەنـدۆی هاوڕێـم کـەوت، بەیەکـەوە سـەردانی سـابیر ڕەشـیدو عەبدولباسـیت فەرهـادی و ئـازاد خۆشـناومان کـرد. ئـەوان لـە نزیـک پەیکەرەکـەی مەعـروف ڕەسـافی لـە خانووێکـی کـۆن ژوورێکیـان گرتبـوو.

ساتێکی خۆشمان بەیەکەوە بەسەربرد، دوایی من و زیاد مەندۆ بەجێمانهێشتن. زیاد مەندۆ گەڕاوە وەحدەکەی خۆی، منیش گەڕامەوە هۆتێل ئەحمەد.
پاش ئەوەی ئەزموونەکانم تەواوبوون، گەڕامەوە شاری سلێمانی، چوومەوە وەحدەکەم. کە گەیشتمە جێ، مولازم غەنی کە منی بینی، هەر لە دوورەوە بانگی کردم و پێی وتم: تۆ خیانەتت کردووە، لیژنەی لێکۆڵینەوەمان بۆت پێکهێناوە.
منیش وتم: گەورەم چۆن خیانەت دەکەم، پێویستە سەرەتا گوێم لێبگرن بزانن بۆچی یەکتریمان نەبینی.
وتی: تۆ ئاگاداری چەتەکانی شاخت کردۆتەوە کە بێنە سەر ڕێگامان و چەک و تەقەمەنییەکانمان لێ بستێنن.
منیش چیرۆکەکەم لە سەرەتاوە تا کۆتایی بۆی گێڕایەوەو پێموت: ناونیشانی ماڵی ئێوەم پێنەدەزانی دەنا هەر ئەو ڕۆژە دەهاتمە لات و ئاگادارم دەکردیتەوە. ئەگەر بڕواش ناکەیت، ئارام بگرە، دوای چەند ڕۆژێکی تر نووسراوی ئینزیباتخانەی حارسیەتان دەگاتە دەست و بەچاوی خۆتان گشت ڕاستیەکان دەبینن.
کە ئەمەم وت، لە قاقای پێکەنینی دا وتی: مەترسێ، گاڵتەت لەگەڵ دەکەم، من باوەڕی تەواوم بەتۆ هەیە.
دوای چەند ڕۆژێک نووسراوەکە گەیشت، تیایدا ماوەی یەک مانگ سزای گرتنیان بۆم بڕیبۆوە.
نائیب زابت موتەشەر کە نووسراوەکەی پیشاندام بە پێکەنینەوە وتی: ئەبو قەبەچ ئەمجارە نە کەو وەنە تابلۆی هونەری دادی بۆت نابێت، ئامیر ئەم نووسراوە ببینی ناتوانێ هیچت بۆبکات، یەک مانگ فڕێت دەداتە ژوورەوە.

عەریـف سـالّح زۆری پـێ ناخـۆش بـوو، پێـی وتـم کـە خەفـەت مەخۆ، پێش ئـەوەی ئامیـر فەرمـان بـە جێبەجێکردنـی نووسـراوەکە بـدات، بچـۆ بـۆ لای، داوای لـێ بکـە بتبەخشـێت، ئـەو دەتوانـێ سـزایەکەت بـۆ بڵاوبکاتـەوە بەبـێ ئـەوەی حەپسـت بـکات.

بەقسـەی عەریـف سـالّحم کـرد، چوومـە لای ئامیـر، دوای ئـەوەی چیرۆکەکـەم بـۆی گێڕایـەوە، ئینجـا داوای بەخشـینم لێـی کـرد.

ئامیرەکەمـان منـی زۆر خۆشدەویسـت، بۆیـە پێـی وتـم: ئەگـەر نووسـراوەکە هاتـە بەردەسـتم، ناتخەمـە حەپسـخانە، تەنهـا سـزاکەت بـۆ نەشـر دەکـەم.

بـەم شـێوەیە، ئـەم کێشەیەشـم لەکـۆڵ بـۆوە. سـەربازی بـۆ مـن زۆر ناخـۆش بـوو، کـە بیـرم لێـی دەکـردەوە، لـە دڵـی خۆمـدا دەمـوت (سـێ سـاڵ زۆرە پێـم تـەواو ناکـرێ)، بۆیـە بیـرم لـە ڕێگاچارەیەکـی تـر دەکردەوە، کـە خۆمـی پـێ ڕزگارکـەم. ئەویش ئەوەبـوو، پێـش ئـەوەی نـاوی سـەربازیم بێـت، کاتێـک کـە قوتابـی پۆلـی چوارەمـی ئامادەیـی بـووم، دوای ئـەوەی مـەلا مستەفا لەگـەڵ حکومەتـی عێـراق لەسـەر دۆزی کـورد نەگەیشـتنە ڕێککەوتـن، چەکـی لـە دژی حکومـەت هەڵگـرت و چـووە شـاخ. منیـش وەکـو زۆربـەی خەڵکـی کوردسـتان پەیوەندیـم پێوەکـردن و چەنـد مانگێـک لـە شـاخ مامـەوە.

ئیتـر ئەوەبـوو، لەنـاو سـەربازەکان بەئەنقەسـت چیرۆکـی ئـەو چوونـە سـەرەوەیەم بۆیـان دەگێڕایـەوەو هەندێکیـش زێدەڕۆییـم لـە گێڕانـەوەی ڕووداوەکان دەکـرد. مەبەسـتم ئەوەبـوو کـە ئـەم هەواڵـە بگاتـە بەرگوێـی ئامیـرو زابتـی تەوجیهـی سیاسـیی وەحدەکەمـان، تاکـو بـە عائیـدون، لـە قەڵەمـم بـدەن و لـە سـەربازی تەسـریحم بکـەن.

ڕۆژێک لە بابولنیزام پاسەوان بووم، لەکاتی ئێشکگرییە کەمدا ئامیری لیواکەمان بە جێبێکی قیادە هاتە وەحدەکەمان.
منیش لە تەنەکب سیلاح و جەنبەک سیلاح و تەحیەی سەربازی زۆر خراپ بووم، بەدرێژی ماوەی مەشقکردنم لە بنکەی مەشقکردنی سەربازی لە کەرکوک ئەو مەشقە فێر نەبووبووم. بۆیە تەنها دەستی ڕاستەم بۆی بەرز کردەوە و وەکو کەسانی ئاسایی سڵاوم لێی کرد.
هەندەی پێنەچوو، ئامیری وەحدەکەمان ئینزباتێکی ناردە لام بێریەکەی لەسەر هێنامە خوارەوە و منی بە تۆمەتبار بردە بەردەمی.
ئامیرەکەمان لەگەڵ ئامیر لیوا لە ژوورەوە لەسەر قەنەفەیەک دانیشتبوون. بەرلەوەی ئامیرەکەمان قسەم لەگەڵ بکات، ئامیرلیوا ڕووی تێکردم و بە تووڕەییەوە وتی: تۆ چۆن سەربازێکی، کەسانی مەدەنی و سەربازی لەیەکتری جیا ناکەیتەوە. تۆ دەزانی من کێم؟
منیش وتم: تۆ ئامیر لیوای.
وتی: ئەی بۆچی سڵاوی سەربازیت بۆ نەکردم؟ تۆ بێڕێزیت بەرامبەرم کردووەو دەبێ سزا بدرێیت.
منیش وتم: مەبەستم بێڕێزیکردن بەرامبەر تۆ نەبووە، من وا لێڕاهاتوومە، پێش ئەوەی ناوی سەربازیم بێت، پەیوەندیم بە شۆڕشی کورد کردووە، ئێمە لەناو شۆڕش کاتێک مەلا مستەفامان دەبینی، بەم شێوەیەی ئێستا سڵاومان لێی دەکرد، هیچ نیگەران نەدەبوو، لەسەرئەوە قەتیش سزا نەدراوین.
کە ئەمەم وت، ئامیرلیوا چاوی چووە پشتی سەریەوەو وەکو فیشەکە شێتەی لێهات، ڕوی لە ئامیری وەحد ەمان کردو

بەتورەییەوە پێی وت: ئێوە چۆن ئامیرێکن، موخەڕیبێکتان لە وەحدەکەتان داڵدەداوەو بەبێ خەمیش لێرە دانیشتوونە. ئێوە ناترسێن ئەو سەربازە تاکو ئێستاش پەیوەندی بەو چەکدارانەوە هەبێت و زانیاری لەسەر وەحدەکەتان بۆ ئەوان بنێرێت و زیانێکتان پێبگەیەنێت؟

ن س وتی: ئێمە ئەوەمان نەزانیوە، خۆشی قەت باسی ئەوەی لای ئێمە نەکردووە، بەڵام سەرەڕای ئەمەش باوەڕی تەواوم پێیەتی، ئەو کەسێکی خراپ نییە تاکو گومانی لێبکەم.

ئامیر لیوا ڕووی لەمن کردو بەتووڕەییەوە وتی: سووچی تۆ نییە، سووچی ئەو کەسەیە کە تۆی کردۆتە سەربازو لێرەی داناویت.

بەم شێوەیە، ئەمجارەش لە سزا ڕزگارم بوو، بێریەکەم لەسەرم نایەوەو چوومەوە بابولنیزام بۆ تەواوکردنی ئەرکەکەم.

پاش ئەوەی ئامیر لیوا ڕۆیشت، ئامیری وەحدەکەمان لەدوای ناردم و پێی وتم: کوڕم بۆچی پێشتر باسی ئەوەت بۆ نەکردین کە پێشتر پەیوەندیت بە موخەڕیبەکانەوە هەبووە.

منیش وتم: گەورەم من وامزانی ئێوە هەموو شتێک لەبارەی منەوە دەزانن، بۆیە باسم نەکردووە.

وتی: ئەگەر حەفتەیەک ئیجازەت بدەمێ، دەتوانی لەو شوێنەی کاتی خۆی خۆت لێی ڕادەست کردووە، نووسراوێکی پشتگیریمان بۆ بێنی کە پەیوەندیت بە موخەڕیبەکانەوە هەبووە؟

وتم: بەڵێ دەتوانم، کاتی خۆی حکومەت لێبووردنی گشتی دەرکرد بۆ ئەوکەسانەی کە پەیوەندییان بە سەرەوە کردووە، منیش خۆم ڕادەستی دایەرەی ئەمنی هەولێر کردو سوودمەند

بووم لەو لێبووردنە و گەڕامەوە سەر خوێندنی خۆم لە ئامادەیی کوردستان.
ئامیرەکەمان نموزەجێکی ئیجازەی لە چەکمەجەکەی بەردەمی دەرهێنا و بۆی پڕ کردمەوەو وتی: هەر ئێستا بگەڕێوە هەولێرو نەگەڕێیتەوە تاکو نووسراوێکی پشتگیریمان بۆدەهێنیت. هەروەها دەفتەری خدمەکەشت لەبیر نەچێ.
هەرچەند ئامیر پێی نەوتم مەبەستی چییە، بەلام من تێگەیشتم کە دەیەوێ بەناوی کوردە گەڕاوەکان لە سەربازی تەسریحم بکات. بۆیە لەخۆشییان قاچەکانم زەوییان نەدەگرت. بەپەلە خۆم گەیاندە شاری سلێمانی و چوومەوە هۆتێل و جلە سەربازیەکانم داکەندو جلی مەدەنیم پۆشی، دوایی چوومە گەراج و لەوێشەوە لەگەڵ قەمەرەیەک بەرێگای کۆیە چوومەوە هەولێر.
کە گەیشتمە ماڵەوە، باوکم لەجیاتی ئەوەی دڵی بەهاتنەوەم خۆشبێت، زۆر جوێنی پێدام وتی: قەت تۆ نابیتە پیاو، لەژیانمدا سەربازی لاسارو موخەربەتی وەکو تۆم نەبینیوە، نازانم ئەو ئامیرانە چۆن لێت ڕازین، بۆچی ناتخەنە حەپسخانەوەو لەکۆڵ ئێمەشت ناکەنەوە.
منیش بە پێکەنینەوە پێم وت: باوکە ئەمجارە تەسریح دەبم و بەیەکجاری دەگەڕێمەوە.
کە ئەمەم وت باوکم باوەڕی پێنەکردم، جڕتێکی کێشا وتی: تڕحێو، هەمووی چەند مانگێکە تۆ چوویتە سەربازی چۆن وا زوو تەسریح دەبیت؟
منیش وتم: لەبیرتە کاتی خۆی لەساڵی ١٩٧٤ کە چوومە سەرەوەو پەیوەندیم بە شۆڕشەوە کرد، تۆ پێت ناخۆش بوو، کە بە سەردان هاتمەوە، لە ترسی گرتنی خۆت، ڕادەستی

دایەرەی ئەمنت کردمەوە. ئەوکات بەبەر لێبووردنە حکومەت کەوتم و گەڕامەوە قوتابخانە.

وتی: لەبیرمە، تەنانەت بەڕێوەبەری قوتابخانەکەشتان مامۆستا مەدحەت محەمەد سەفوەت زۆری پێخۆش بوو، نەیهێشت ئەو ساڵەت بڕوات، خولی دووەم تاقیکردنەوەی پێکردیتەوەو یارمەتیشی دایت تاکو دەربچیت. بەڵام پێم ناڵێی ئەوە چ پەیوەندییێکی بە تەسریحبوونی تۆوە هەیە؟

وتم: کاتی خۆی حکومەت ئەو کەسانەی کە پەیوەندیان بەشۆڕشەوە کردبوو هەموویانی لەسەربازی بەخشی و ئەوانەش کە سەربازبوون تەسریحی کردن. ئێستاش ئامیرەکەمان دەیەوێ بەهەمان بڕیار منیش تەسریح بکات.

باوکم ئەقڵی قسەکانی منی نەگرت، سەری خۆی لەقاندو لەبەرخۆیەوە بە بە دەنگێکی نزم وتی: لاحول ولاقوە الا باللە. ئەمەندەی وت و هیچ قسەی تری نەکرد.

ڕۆژی دوایی چوومە پارێزگای هەولێر، چوومە لای بەڕێوەبەری کاروباری ناوخۆ، نووسراوەکەم دایە دەستی. پاش ئەوەی کە خوێندیەوە وتی: ئەگەر ئەو ڕۆژەمان پێ بڵێیت کە پەیوەندیت بە سەرەوە کردووە، هەروەها ڕۆژی گەڕانەوەت، دەتوانین فایلەکەت زووتر بدۆزینەوەو زووتر وەڵامی ئەم نووسراوە بدەینەوە.

منیش وتم: لە ڕێکەوتی ١٩٧٤/٣/١٥ چوومە سەرەوەو لە ڕێکەوتی ١٩٧٤/٨/٢١ لە هەمان ساڵ بەسەردان گەڕامەوە ماڵەوە، باوکم لەڕێگەی حوسێن ئاغای سورچی تەسلیمی دایەرەی ئەمنی هەولێری کردمەوەو بەر لێبووردنی گشتی کەوتم و گەڕامەوە قوتابخانە.

بەڕێوەبــەری کاروبــاری ناوخــۆی پارێــزگا زانیارییەکانــی لەســەر پارچــە کاغەزێــک نووســیەوەو لەگــەڵ نووســراوی وەحدەکەمــان هاوپێچــی کــرد، وتــی: دوای ســێ ڕۆژی تــر ســەردانم بکــەوە، ئینشــاڵا تاکو ئــەوکات وەڵامەکــەی لــە دایــەرەی ئەمــن دەگەڕێتــەوە.
ئیتــر ئەوەبــوو هــەر لــەو ماوەیــەدا چوومــە دایەرەکــەم، پێــم وتــن: لــەو ڕۆژانــە لــە ســەربازی تەســریح دەبــم.
کارمەنــدەکان وەکــو باوکــم باوەڕیــان پێنەکــردم، زۆر بــە قســەکانم پێکەنینیــان هــات، وتیــان: قســەیەک بکــە تۆزێــک ڕێگای تێبچێــت، هێشــتان ســاڵێک بەســەر ســەربازیەکەت ڕەت نەبــووە، چــۆن وا زوو تەســریحت دەکــەن.
دوای تێپەڕبوونــی ســێ ڕۆژ، جارێکــی تــر چوومــەوە دیوانــی پارێــزگا، چوومــە لای بەڕێوەبــەری کاروبــاری ناوخــۆ. کــە چــاوی پێــم کــەوت، پێــی وتــم: وەڵامــی نووســراوی وەحدەکەتانــم داوەتــەوە، هەرچەنــد نووســراوەکە نهێنییــە، بــەڵام بۆئــەوەی زۆر دوانەکەوێــت، ئەیدەینــەوە دەســت خــۆت.
منیــش وتــم: ڕاســت دەکــەی، ئامیرەکەشــمان پێــی وتــم لەگــەڵ وەڵامــی نووســراوەکە، دەفتــەری خدمەکەشــت بهێنــە، وابزانــم نیــازی وایــە تەســریحم بــکات.
وتــی: ئــەوە ڕاســتە، لــەم ڕۆژانــەدا، نووســراوێکمان لــە وەزارەتــی بەرگریــی عێــراق بۆهاتــووە، تیایــدا جەخــت لەســەر تەســریحکردنی ئــەو ســەربازانە دەکاتــەوە کــە پێشــتر پەیوەندییــان بــە مــەلا مســتەفاوە کــردووە.
کــە بەڕێوەبــەری کاروبــاری ناوخــۆی پارێــزگا ئەمــەی وت، لــە بۆچوونەکــەم زیاتــر دڵنیابــووم، لەخۆشــییان وەخــت بــوو بــاڵ بگــرم و بفــڕم.

هــەر ئــەو ڕۆژە گەڕامــەوە شــاری ســلێمانی و پێــش ڕۆژئاوابــوون گەیشـتمە جـێ و بـە پاسـی کارێـزە وشـکە چوومـە وەحدەکەمـان و نووسـراوەکەم بـردە قەڵـەم. عەریـف ساڵح زەرفەکـەی لێوەرگرتـم و کردیـەوە، نووسـراوەکەی دەرهێنـا و خوێندیـەوە. دوای خوێندنـەوەی ڕووی تێکـردم وتـی: چمـا تـۆ پێشـتر موخەڕیبیـش بوویـت، ئەوجـا ئامیریـش هێنـدە پشـتی پێـت دەبەسـت؟

منیش وتم: بۆچی ئەوەی چووبێتە سەرەوە دەبێتە موخەڕیب؟

وتی: من وات پێناڵێم، ئەو نووسراوەی تۆ هێناوتە وات پێدەڵێ.

عەریـف سـاڵح کـە هەسـتی کـرد بـە قسـەکانی زوێـر بـووم، وتـی: گاڵتــەت لەگــەڵ دەکــەم، ئەوەنــدەی بەیەکــەوە کارمــان کــردووە هیـچ خراپەیەکـم لەتـۆ نەبینیـوە، هەقیشـم لـە حکومـەت نییـە، گرینـگ ئەوەیـە تـۆ هیـچ زیانـت بـۆ ئێمـە نەبـووە.

وتم: ئێستا مامەڵەکەم بۆ دەڕوێنن؟

وتـی: ئامیـر لـە نیـوەڕۆوە دابەزیـوە، کـە گـەڕاوە، ئەوسـا لەگـەڵ بەریـد بـۆی دەبـەم، کـە لەسـەری نووسـی، ئینجـا جێبەجێـی دەکەیـن.

ئــەو ڕۆژە زۆر دڵخــۆش بــووم، شــەو تاکــو بەیانــی لەخۆشــییان خــەو نەچــووە چاوەکانــم. بەیانــی کــە لــە خــەو هەســتام چوومــە لای عەریـف سـاڵح و پێـم وت: پێویسـت دەکات مەشـق بکـەم؟

وتـی: پێویسـت نـاکات، سـەعات هەشـت ئامیـر لـە شـوێنی خـۆی دادەنیشـێت، ئـەوکات نووسـراوەکەی بـۆ دەبـەم. تـا سـەربازەکان لـە مەشـق تـەواو دەبـن، تـۆ لێـرە لـەلای مـن بـە، دەتنێرمـە کـۆگا و مەشـجەب، چـەک و کەلوپەلـە سـەربازیەکانت بـدەوە ئـەوان و پاکانــەم بــۆ بێنــە. تاکــو تــۆ ئەمــە دەکەیــت، منیــش دەفتــەر خدمەکـەت بـۆ پـڕ دەکەمـەوە.

بەم شێوەیە، بەدەم ئەم قسە خۆشانەوە کات زۆر بەخێرایی دەڕۆیشت، خۆشم نەمزانی چۆن سەعات هەشت هات و عەریف ساڵح نووسراوەکەی بردە لای ئامیر. هەندەی پێنەچوو، ئامیر خزمەتکارە سەربازەکەی بەدوادا ناردم. کە چوومە لای وتی: هەرچەند زۆرم پێناخۆشە کە تۆ بەجێمان دەهێڵی، بەڵام هەرچۆنێک بێت ژیانی مەدەنی لە ژیانی سەربازی خۆشترە، بۆیە پیرۆزباییت لێدەکەم و هیوای ژیانێکی خۆشت بۆ دەخوازم.

تاکو سەربازەکان لە مەشقکردن گەڕانەوە، مامەڵەکەم تەواو بوو، چاوەڕێی ئەوانم دەکرد، تاکو ماڵئاواییان لێبکەم.

سەربازەکان هیچ زانیارییێکیان لەسەر تەسریحبوونم نەبوو، بۆیە کە منیان بەجلی مەدەنی بینی سەریان سوڕما، وتیان: تۆ دوێنێ لە ئیجازە هاتوویەوە، ناکات دیسان ئیجازەبیت؟

بەپێکەنینەوە پێم وتن: ئەمجارە بەیەکجاری دەڕۆمەوە، جارێکی تر بەجلی سەربازی نامبیننەوە.

یەکتریمان ماچکرد، دوایی چوومە بابولنیزام، لەسەر شەقامە گشتیەکە، بە پاسی کارێزەوشکە چوومە سلێمانی و لەوێشەوە چوومە گەراج و هەر هەمان ڕۆژ گەڕامەوە شاری هەولێر.

# ژیانێکی تر

دوای تەسریحبوونم لە سەربازی، گەڕامەوە دایەرەکەم و دەسبەکار بوومەوە. فەرمانبەرەکان پێشوازییێکی گەرمیان لێکردم، بەسەر سوڕمانەوە وتیان: تۆ باشی لێدەزانیت، کاتی خۆی کە ئێمەیان بردە سەربازی ساڵێکیشیان لەکاتی خۆی زیاتر پێکردین ئینجا تەسریحیان کردین. تۆ بەناوی سێ ساڵ ڕۆیشتی کەچی ساڵێکیشت تەواو نەکردو تەسریح بوویت.

بەرپرسی فەرمانگەکەمان لەدوای ناردم و داوای لێکردم کە بگەڕێمەوە هاوینەهەوارەکانی پیرمام بۆ سەرپەرشتیکردنی خانووە گەشتیارەکان و مەلەوانگەکە. هەر بەو بۆنەیەشەوە خانووێکی گەشتیاری بە کەلوپەلەوە بەخۆڕایی دامێ، وتی: ساڵی ڕابردوو فەرمانبەرێکی وەکو تۆ باشمان دەست نەکەوت، بۆیە لەگەڵ گەشتیاران زۆر کێشەمان بۆ دروست بوو. هیوادارم وەکو ساڵانی ڕابردوو کارەکانت بەسەرکەوتوویی بکەیت.

ماوەی سێ ساڵ بەرپرسی خانووەکان و مەلەوانگەی پیرمام بووم، هەر لەو ماوەیەدا هاوسەرگیریم کردو لەگەڵ هاوسەرەکەم، لەو شوێنە گەشتیارییە ژیانمان بەسەربرد.

ژیانمان زۆر خۆش بوو، لە هەموو شوێنەکانی عێراق و تەنانەت لە وڵاتانی کەنداوی عەرەبیش گەشتیاران ڕوویان تێدەکردین. سروشتێکی ڕەنگین و ئاووهەوایەکی ساف و بێگەردی هەبوو، دەتوت ئەو بەهەشتەیە کە خوا لە قورئانی پیرۆز باسی کردووە.

لەوێ بۆخۆم گەورە و کوێخا بووم، سیروان جافی ئەمینداری گشتی شارەوانی و هاوینەهەوارەکان دەسەڵاتێکی تەواوی پێدابووم، بۆیە حسێبم بۆ کەس نەدەکرد.

جارێـک حاجـی خێـروڵا توڵفاحـی خاڵـی سـەرۆک کۆمـار هاتـە پیرمـام، بۆمـاوەی دوو هەفتـە لـە خانووێکـی گەشـتیاری لـەلای ئێمـە مایـەوە. ئـەو کەسـێکی کـراوەو کۆمەلایەتـی بـوو، زۆر حـەزی لـە ئاوەدانـی و تێکەڵبوونـی خەڵـک بـوو. ئێـواران وێـڕای هاتنـی زۆربـەی بەرپرسـە باڵاکانـی حکومـەت بۆلای، دەیـان هاوڵاتـی سـادەو سـاکاریش دەهاتنـە لای، لەنـاو باخچەکـە لـە چـواردەوری دادەنیشـتن. منیـش ئـەم هەلـەم قۆسـتەوە، داواکاری زۆرێـک لـە دۆسـت و برادەرەکانـی خـۆم پێـی جێبەجێکـرد.

حاجـی خێـروڵا هەرچەنـد خاڵـی سـەدام حوسـێنی سـەرۆک کۆمـارو سـەرۆکی ئەنجومەنـی ڕاژەش بـوو، کەچـی سـەرەڕای ئەمـە زۆر حـەزی لـە وەرگرتنـی دیـاری بـوو، بچووکتریـن دیـاری لـە کـەس ڕەت نەدەکـردەوە.

جارێـک لەبەرچـاوی هەمـووان بـە قایمقامـی سـمێڵی وت: کـوا ئـەو گیسـکەی بڕیاربـوو بەدیـاری بـۆم بێنـی؟

ئەویش وتی: وامزانی بەگاڵتە وادەڵێی، بۆیە بۆم نەهێنایت.

حاجـی خێـروڵاش وتـی: ئەگـەر ئەمـڕۆ بـۆم نەهێنـی، لەگەڕانـەوەم بـە سـەدام حوسـێن دەڵێـم فەرمانـی دامەزرانەکـەت هەڵوەشـێنێتەوە و بتگەڕێنێتـەوە شـوێنی جـاران. قایمقامـی سـمێڵیش وتـی: بەڵێنـت پێـدەدەم پێـش ئـەوەی بگەڕێمـەوە دهـۆک، بۆتـی دەهێنـم.

حاجـی خێـروڵا کەسـێکی عەشـایەری بـوو، خەڵـک لـە هەمـوو لایەکـەوە ڕوویـان تێـی دەکـردو سـکاڵا و داواکاریەکانیـان بـۆی دەهێنـا، واسـیدەیان پێـی دەکـرد بـۆ ڕاپەڕاندنـی کارەکانیـان لای گـەورە بەرپرسـانی حکومـەت.

ئێوارەیـەک لـەلای حاجـی خێـروڵا دانیشـتبووم، پارێـزگاری هەولێـر بەهادیـن محەمـەد هاتـە لای، پێـی وت: سـەیدولڕەئیس جێگۆڕکێـی بـە مـن و پارێـزگاری دهـۆک بەحیـا جـاف کـردووە، مـن دەچمـە

شـوێنەکەی ئـەو، ئەویـش دێتـە شـوێنی مـن. هـەر بـەو بۆنەیەشـەوە برادەرانـی مەجلیسـی تەنفیـزی لـە هۆتێلـی هەورامـان ئێمەیـان بـۆ خوانـی نیـوەڕۆ بانگێشـت کـردووە. سـەرۆکی مەجلیسـی تەنفیـزی و تەشـریعی و گشـت ئەمینـدارە گشـتیەکان ئامـادە دەبـن، حەزدەکـەم تـۆش ئامادەبیـت و نانێکمـان لەگـەڵ بخۆیـت.

وەکـو وتـم حاجـی خێـروڵا قـەت دەسـتی کەرەمـی نەدەگێڕایـەوە، زۆر حـەزی لـەو بـەزم و ڕەزمـە بـوو. دەعوەتەکـەی قبوڵکـرد، ڕووی لـە منیـش کـرد پێـی وتـم: تـۆش دەعوەتـی منـی، بەیانـی وەرە لای مـن، بەیەکـەوە دەچینـە هۆتێـل هەورامـان بـۆ ئـەو خوانـە.

منیـش ئەمـەم زۆر پـێ خـۆش بـوو، لەدڵـی خۆمـدا وتـم (بەسـایەی حاجـی خێـروڵا نانێکـی چـەور دەخـۆم و ئـەو بەرپرسـانەش دەناسـم، تەنانـەت ئەمینـداری ئێمـە، کـە مـن و حاجـی بەیەکـەوە ببینـێ لەمـەودوا حسـێبێکی تایبەتیـم بـۆ دەکات و پـاروم دەکەوێتـە نـاو ڕۆن.

بـۆ بەیانـی لەگـەڵ حاجـی خێـروڵا بەیەکـەوە چووینـە هۆتێـل هەورامـان. خوانێکـی گەورەیـان ڕازاندبـۆوە، زۆربـەی بەرپرسـەباڵاکانی کوردسـتان لـەوێ ئامـادە بـوون. کـە ئەمیندارەکەمـان منـی لەگـەڵ حاجـی خێـروڵا بینـی، سـەری سـوڕما، لەگـەڵ جێگرەکـەی پسەپسـێکی کـرد، نەمزانـی چییـان وت، بـەڵام هەسـتمکرد کـە باسـی مـن دەکـەن.

یەکـەم ڕۆژ بـوو لـە ژیانمـدا کـە نانێکـی خـۆش لەگـەڵ کۆمەڵێـک بەرپرسـی بـاڵا بخـۆم. ئـەو بەرپرسـانەم لەنزیـک حاجـی خێـروڵا زۆر بـە زەلیلـی دەبینـی، خۆیـان زۆر بچـووک دەکـردەوە و تەمەلوقیـان بـۆی دەکـرد، دەتـوت خزمەتـکاری ئـەون، هێنـدە بـێ کەسـایەتی بـوون.

هەروەکـو پێشـبینیم دەکـرد، بـۆ بەیانـی ئەمینـداری گشـتی لـەدوای نـاردم و پێـی وتـم: لەمـەودوا هەرشـتێکت ویسـت، ڕاسـتەوخۆ وەرە لای مـن، بەکـەس مەڵـێ، خـۆم بۆتـی جێبەجـێ دەکـەم. تـۆش ئاگایەکـت لـە مـن بێـت، بـە حاجـی خێـروڵا بڵـێ لای سـەیدولڕەئیس پشـتگیریم

بـكات و وەزیفەیەكـی باشـترم بداتـێ. بـە سـەر لەقاندنـەوە پێـم وت: باسـی تـۆم لـەلای كـردووە، پێـم وتـووە كـە ئەمیندارێكـی بـاش و لێهاتـووی.

لـە هاوینەهـەواری پیرمـام ئۆرزدیباكێكـی بچووكـی لـێ بـوو، حكومـەت لەبـەر گەشـتیاران زۆر بایەخـی پێـدەدا، كـەل وپەلـی جـوان و سـەرنجڕاكێش و نـاوازەی لـێ دادەنـدرا. نـاوە نـاوە سـەردانی ئـەو ئۆرزدیـەم دەكـرد، بـۆ كڕینـی پێداویسـتییەكانم.

ڕۆژێـك لەنـاو ئۆرزدییەكـە بـووم، لەپـڕ بـووە غەڵبـە غەڵـب، قەرەباڵغییێكـی زۆر پەیدابـوو، كـە سـەیرم كـرد، سـاجیدەی خێـروڵا توڵفـاح هاوسـەری سـەدام حوسـێن سـەرۆك كۆمـار، خـۆی و منداڵەكانـی بەژوورکەوتـن.

هاوسـەرەكەی سـەرۆك كۆمـار دەتـوت قـەت شـتی جوانـی نەبینیـوە، چـاوی بەهەرشـتێك دەكـەوت، بـە سەرسـوڕمانەوە دەیـوت (ئەمـە زۆر جوانـە دانەیەكـم بـۆ دابنـێ).

كـە ئـەم دیمەنـەم بینـی زۆر سـەرم سـوڕما، زگـم بـە هاوسـەری سـەرۆك كۆمـار سـووتا، لـە دڵـی خۆمـدا وتـم (ئـەو بەسـتەزمانە دەڵێـی قـەت دونیـای نەبینیـوە، هـەر لەنـاو چـوار دیـوار بـووە، وا سـەری سـوڕماوە و هەمـوو شـتێكی پـێ جوانـە).

ئـەم ڕۆژە خۆشـانەم لـە هاوینەهـەواری پیرمـام زۆری نەخایانـد، شـەڕی عێـراق و ئێـران دەسـتی پێكـرد، جارێكـی تـر حكومـەت داوای مەوالیـدی ئێمـەی بـۆ سـەربازی كـردەوە. چەنـد مانگێـك بـوو خـوا كچێكـی جوانـی پـێ بەخشـیبووین، بـەڵام ئـەم شـەڕە نەگریسـە هەمـوو شـتێكی لـێ تێكدایـن و ژیانـی لێكردینـە دۆزەخ. منیـش بەناچـاری چوومـە سـەربازی و هاوسـەرەكەم و كچـە تاقانەكـەم بەبـێ نـازی و بـە تەنیایـی بەجێهێشـتن.

# جارێکی تر بوومەوە سەرباز

ساڵێک و چەند مانگێک بەسەر هاوسەرگیریمان تێپەڕیبوو، خودا کچێکی جوانی دابووینێ، زۆر دڵمان بە دونیا خۆش بوو، کەچی ئەم خۆشییە زۆری نەخایاند، ڕۆژی ١٩٨٠/٩/٤ لەگەڵ هاوسەرەکەم لە ناو باخچەی ماڵەوەمان دانیشتبووین، چایە و چەرەزاتمان دەخوارد، ڕادیۆیەکی بچووکیشم لەلای خۆم دانابوو، ئوم کەلسوم گۆرانی (فەککەرووني) بەدەنگە زوڵاڵەکەی دەوت.
پێش ئەوەی گۆرانییەکە تەواوبێ، لەناکاو پچڕا، پێشکەشکەری هەواڵەکان ڕوشدی عەبدولساحیب بەدەنگێکی گەورە وتی (سەرنجتان بۆ هەواڵێکی گرینگ ڕادەکێشین، پاش تۆزێکی تر سەیدولرەئیس سەدام حوسێن وتارێکی مێژوویيتان پێشکەش دەکات). دوای ئەوە چەند سرودێکی نیشتمانی یەک لەدوای یەک لێدرا.
دوای کاتژمێرێک سڵاوی کۆماری لێدرا، ئینجا سەرۆک کۆمار وتارەکەی پێشکەشکرد. لە وتارەکەیدا باسی لەوەکرد، کە ئێران دەستپێشخەر بووە لە شەڕفرۆشتن بە عێراق و لە باشووردا سنوورەکانی عێراقی بۆردومانکردووە، بەمەش دەرگای دۆزەخیان بۆخۆیان کردۆتەوە، ئەوان لەبیریان چووە عێراق شەڕ بەکەس نافرۆشێت، بەڵام شەڕو گێچەڵیش لەکەس قبوڵ ناکات. هەر لەمیانی وتارەکەیدا داوای لە سەرکردەی هێزە چەکدارەکانی وشکانی و دەریایی و ئاسمانی کرد، جووڵە بە یەکە سەربازیەکانیان بکەن و بە توندی وەڵامیان بدەنەوە.
دوای تەواوبوونی وتاری سەرۆک کۆمار، ئێزگە بەردەوام بوو لە پەخشەکانی بە سروودی نیشتمانی و خوێندنەوەی شیعرو

گۆرانـــی، هونەرمەنـــد داود قەیســـی کۆمەڵێــک گۆرانـــی ورووژێنـــەری نوێـــی پێشکەشـــکرد.
بـــەم شـــێوەیە دانیشـــتنەکەمان لـــێ تێکچـــوو، چایەکەمـــان لـــێ بـــووە ژەقنەبـــووت، خەمێکـــی گـــەورە ســـەرودڵی گرتیـــن. مـــن خەمـــی خـــۆم نەبـــوو، چونکـــە جارێکـــی تـــر سەربازیم کردبوو، فێـــری کلاوات ببـــووم، دەمزانـــی چـــۆن ڕۆژەکان بەڕێدەکـــەم. بـــەڵام لـــە خەمـــی هاوســـەرەکەم و منداڵـــە تاقانەکەمـــدا بـــوم، کـــە هەمـــووی چەنـــد مانگێـــک بـــوو خـــوا پێـــی بەخشـــیبووین. لەبیـــری خۆمـــدا دەمـــوت (ئەگـــەر مـــن بەجێیـــان بێڵـــم کـــەس نییـــە ئاگاداریـــان بێـــت).
ئەمـــەو لـــە ١٩٨٠/٩/١٧ بـــە بڕیارێکـــی ئەنجوومەنـــی ســـەرکردایەتی شـــۆڕش ڕێککەوتننامـــەی ساڵی ١٩٧٥ی لەگـــەڵ ئێـــران هەڵوەشـــاندەوە و ئـــاوی شـــەتولعەرەبی بـــە تەواوەتـــی بـــە بەشـــێک لـــە ئـــاوی ئیقلیمـــی عێراقـــی دانـــا. ئـــەم ڕێککەوتننامەیـــە لـــە لایـــەن گەلـــی کـــورد بـــە ڕێککەوتننامەیەکـــی شـــووم دا دەنـــدرا، بەنێوەندگیـــری ســـەرۆکی جەزائیـــر محەمـــەد ئیبراهیـــم بـــو خروبـــە ناســـراو بـــە (هـــەواری بۆمدیـــن) لـــە نێـــوان شـــای ئێـــران و ســـەدام حوســـێن بـــۆ توانـــەوەی شۆڕشـــی کـــورد بەســـترا.
تـــا دەهـــات شـــەڕەکە گـــەرم و گوڕتـــر دەبـــوو، بـــە ماوەیەکـــی کـــەم عێـــراق توانـــی بچێتـــە نـــاو خاکـــی ئێـــران و هەندێـــک ناوچـــە داگیـــر بـــکات.
ڕۆژێـــک چوومـــە دایەرەکەمـــان، دەوامـــی ئاســـایی خـــۆم کـــرد. بەرپرســـی خۆیەتـــی تەلەفۆنـــی بۆکـــردم، پێـــی وتـــم کـــە دەبـــێ هـــەر ئێســـتا دەســـت لـــەکار هەڵبگـــرم و پەیوەنـــدی بـــە تەجنیـــدەوە بکـــەم، مووچەکەشـــم بـــۆ خـــەرج ناکـــەن ئەگـــەر مانگانـــە نووســـراوێکی پشـــتگیرییان لـــە وەحدەکەمـــان بـــۆ نەهێنـــم.
بەناچـــاری گەڕامـــەوە ماڵـــەوە، دەســـتێک جلـــی ژێـــرەوەو پەشـــتەماڵێک

و تاقمــی تەراشــەکەم خســتە جانتایەکــەوە، دوایــی هاوســەرەکەمم لــە ئامێــز گــرت و ماڵئاواییــم لێکــردن، وتــم: دەبــێ هــەر ئەمــڕۆ پەیوەنـدی بـە تەجنیـدەوە بکـەم، لەوانەیـە هـەر ئەمـڕۆش بـۆ بنکـەی مەشـقکردن بمانگوازنـەوە. ئەگـەر نەگەڕامـەوە دڵ لـەدڵ مـەدە، ئەگـەر بچمـە ئەوپـەڕی دونیـاش وازت لـێ ناهێنـم، ئـاگام لێـت دەبـێ. ئەگـەر شتێکیشـت پێویسـت بـوو، پەیوەنـدی بـە ماڵـی خۆتـان یـان باوکـم بکـە.

هاوسـەرەکەم چاوەکانـی پڕبـوون لـە فرمێسـک، لـە خەفەتـان قسـەی پێنەدەکـرا، منیـش وەکـو ئـەو گریـان لـە قوڕگـم گیـری خواردبـوو، خۆشـم نەمدەزانـی چـۆن ماڵئاواییـم لێـی کـرد. بەتەنیـا بەجێمهێشـت و جانتاکـەم هەڵگـرت و چوومـە دایـەرەی تەجنیـد. خەڵکێکـی زۆر لـە وێ کـۆ بووبوونــەوە و دەفتــەری خدمەکانیــان بەدەســتەوە گرتبــوو، چاوەڕێــی کاتبــی تەجنیدیــان دەکــرد لێیــان وەربگرێــت و بۆیــان پڕبکاتــەوە.

هــەر لــەوێ تاهیــر مەولــود و عەزیــزە ســوور و عەبدولخالیــق ڕەحمــان ڕەســول کاکــێ و هەندێــک هاوڕێــی تریشــم بینــی، کــە ئەوانــم بینــی خەفەتــم لەبیرچــۆوە، چوومــە لایــان، ســڵاوم لێکــردن و یەکتریمــان ماچکــرد.

کەسـێکی گێلۆکـە بـوو، بەکەڵکـی سـەربازی نەدەهـات، بـەڵام وێـڕای ئەمــەش لەســەریان پازنەدابــوو، وەکــو ئێمــە ئەویشــیان بــۆ شــەڕ تۆمارکــرد.

مــن و تاهیــر مەولــود پێشــتر خەڵکــی یــەک گــەڕەک بوویــن، لــە قۆناغــی ســەرەتایی بەیەکــەوە لــە قوتابخانــەی ســۆران لــە گەڕەکــی ســێتاقان لــە بەرامبــەر ماڵــی فەتــاح ئاغــای هەرکــی دەمانخوێنــد، بـەڵام لەبـەر دەسـتکورتی ئـەو هـەر زوو دەسـتی لـە خوێنـدن هەڵگـرت و شـەربەتی ئـاوی مێـوژی لەسـەر عارەبانـە دەفرۆشـت. کەسـێکی ڕوح

سـووک بـوو، بۆیـە پەیوەندیمـان لەگـەڵ یەکتـری نەپچـڕا.
دوای چاوەڕوانییێکـی زۆر ناویـان خوێندینـەوە و دەفتـەر خدمەکانیـان داینـەوە. هەموومانیـان گواستەوە بـۆ سـەربازگەی تەحریـر لـە شـاری بەغـداد. وتیـان ئێمـە خۆمـان ناوەکانتـان بـە لیسـتێک دەنێریـن بـۆ ئـەوێ، ئێـوەش هـەر ئەمـڕۆ بەڕێبکـەون، دەبـێ بەیانـی پەیوەنـدی بـەو سـەربازگەیەوە بکـەن. ئـەوەی دواش بکـەوێ نـاوی بـە نەهاتـوو تۆماردەکرێـت و دەکەوێتـە لیسـتی ڕاکـردووەکان و بەتونـدی سـزادەدرێت.
مـن و تاهیـر و بەیەکـەوە چووینـە گـەراج و بـە کۆسـتەرێک بـەرەو شـاری بەغـداد بەڕێکەوتیـن.
گەراجـی هەولێـر لـە کەسـانی وەکـو ئێمـە جمـەی دەهـات، زۆربەیـان دەچوونـە بەغـداد، بۆیـە شـوفێرەکان خۆیـان خسـتبووە سەرپشـت و کرێیەکـی دووقاتیـان لێمـان داوا دەکـرد. ناچاربوویـن لەگەڵیـان بچیـن، دەنـا دوادەکەوتیـن، بۆیـە لەگـەڵ کۆسـتەرێک بەڕێکەوتیـن.
ئێـوارە گەیشـتینە سـەلمانپاک، شـوفێرەکە کۆسـتەرەکەی لەبـەردەم چێشـتخانەیەک ڕاگـرت، وتـی (نیـو کاتژمێـر پشـوو دەدەیـن ئێـوەش دەتوانـن نانێـک بخـۆن و ئاوێکیـش بـە دەموچاوتانـدا بکـەن).
مـن و تاهیـرو چووینـە چێشـتخانەکە، بەیەکـەوە لەسـەر مێزێـک دانیشـتین. داوای سـێ نەفـەر برنـج و فاسـولیامان کـرد. زۆر بـە خێرایـی خواردنەکـەی تەواوکـردو داوای دوو قاپـی تریشـی کـرد، ئەویشـی خـوارد.
کاتێـک کـە هەسـتاین، تەنیـا پـارەی یـەک نەفـەری دا. سـەرم سـوڕما، ئـەو کەسـێکی دەسـتپاک بـوو، لـەو کەسـانە نەبـوو چـاوی لـە ماڵـی حـەرام بێـت. بۆیـە پێـم وت: تـۆ دوو نەفـەر برنـج و فاسـولیات خواردبـوو، کەچـی تەنیـا پـارەی یـەک نەفـەرت دا، بۆچـی واتکـرد؟
وتی: ئەی بۆچی ئەو سەگبابە پارەی دوو نەفەری لێوەرگرتم؟

وتم: مەبەستت کێیە؟
وتی: مەبەستم شوفێری پاسەکەیە.
من و تاهیر لە قاقای پێکەنینمان دا، وتم: جا ئەو شوفێرە چ پەیوەندییەکی بەو خاوەن چێشتخانەوە هەیە؟!
وتی: بۆیە منیش پارەی یەک نەفەرم دا تاکو جارێکی تر پارەی زیادم لێوەرنەگرن.
پاش ئەوەی گەیشتینە شاری بەغداد، بە تەکسییەک چووینە سەربازگەی تەحریرو کەلوپەلی سەربازیان بەسەرماندا دابەشکرد و بەسەر هۆڵەکاندا دابەشیانکردین. من و تاهیر و شێروان کەوتینە لای یەکتری و لەتەنیشت یەک شوێنی خۆمان ڕاخست.
نزیکەی سێ مانگ لەو بنکە سەربازیە ماینەوە، بەیانیان لە تاریک و ڕوونەوە تاکو ئێوارە مەشقیان پێدەکردین.
بەیانیان پێش ئەوەی من و تاهیر لەخەو هەستین، لە چێشتخانەکە یەک دەبەی پێنج لیتری شیری گەرم و یەک قاپی گەورەش نیسکێنەی بۆ دەهێنایین، شیرەکە بەشی فەسیلێکی دەکرد. هەمووجارێک پێم دەوت: ئەو هەموو شیرە مەهێنە خەسار دەبێت. بەڵام ئەو گوێی بە قسەکانم نەدەداو دەیوت: بخۆن فرسەتە، لە هەولێر شیری وەهامان دەست ناکەوێ زۆر گرانە.
هەروەکو وتم کەسێکی گێلۆکە و دڵساف بوو، زۆربەی پێنجشەممەو جومعان کە ئێمە دادەبەزین و دەگەڕاینەوە هەولێر، ئەو لە بارەگای وەحدە دەمایەوە، دەیوت: کە ئێوە دەڕۆنەوە کەس نییە شیو وەربگرێت، زابتی ئیعاشە پێم دەڵێ (کاکە بە ئارەزووی خۆت گۆشت بخۆ، ئەو مەنجەڵە هەر هەمووی با بۆ تۆبێت).
زۆر جاران پێی دەوتم: تۆش لەگەڵ من بمێنەوە، گۆشتەکە زۆرە با خەسار نەبێ، هەردووکمان بەیەکەوە دەیخۆین.

ڕۆژێـک مـن و لەبـەردەم حانوتـی وەحدەکەمـان ڕاوەستابووین، چایەمـان دەخـواردەوە. عەریفێـک کـە چـاوی بـە ئێمـە کـەوت، بـە ڕاکـردن هاتـە لامـان، ڕووی لـە کـردو پێـی وت: تـۆ بۆچـی دەوام ناکەیـت، غیابەکانـت هەنـدە زۆر بوونـە، لەوانەیـە داخیلـی هـرووب بووبێـت؟
ڕووی لە من کردو پێی وتم: ئەوە چی دەڵێ؟
منیش قسەکانی ئەو عەریفەم بۆی وەرگێڕا سەر زمانی کوردی.
زۆر بەئاسـایی وتـی: ئـەوە نییـە مـن هەمـوو ڕۆژێـک لەگـەڵ ئێـوە دەوام دەکـەم.
منیـش بـە عەریفەکـەم وت: ئـەو سـەربازە کێشـەی چییـە، بـۆم ڕوونبکـەوە، ئـەو هیچـی لـێ نازانێـت.
عەریفەکـە وتـی: ئـەو سـەربازە لـە فەسـیلی منـە، چەنـد ڕۆژێـک دەوامـی کـردووە، بـەڵام ماوەیەکـە دەوام نـاکات.
ڕووم لـە کـرد و پێـم وت: ئـەوە ڕاسـتە تـۆ چەنـد ڕۆژێـک لـە فەسـیلی ئـەو عەریفـە دەوامـت کـردووە؟
وتی: بەڵێ.
وتـم: ئـەی بۆچـی ئێسـتا لەگـەڵ ئێمـە دەوام دەکەیـت و ناچیتـەوە شـوێنی خـۆت؟
وتـی: بـۆ جیـاوازی چییـە؟ ئـەی سـەربازی لـە هـەر کوێیـەک بێـت وەکـو یـەک نییـە؟
قسـەکانی بـۆ عەریفەکـە وەرگێـڕا سـەر زمانـی عەرەبـی. بەپێکەنینـەوە وتـی: بەڕاسـتی ئـەوە شـێتە، دەنـا چـۆن وا بیـر دەکاتـەوە.
منیـش وتـم: ئـەو کەسـێکی گێلۆکەیـە و هەندێـک تەختـەی نوقوسـتانە. خێـرت دەگاتـێ لەگـەڵ خـۆت ببیـە و غیابەکانیشـی بـۆ ڕەشبکەوە.
کـە ئەمـەم وت، عەریفەکـە وتـی: گـوو بـە ڕیشـی باوکـی ئـەو کەسـەی کـە ئـەو بەسـتەزمانەی کردۆتـە سـەرباز، پێشـان کەسـانی وەکـو ئـەو سـەربازییان پێنەدەکـراو دەبەخشـران.

منیش ڕووداوەکەی چێشتخانەی سەلمانپاکم بۆی گێڕایەوە، کە چۆن ئەو تۆڵەی شوفێری کۆستەرەکەی خەتی بەغدای لە خاوەن چێشتخانەکە کردەوە و لەجیاتی نەفەرێک دوو نەفەر برنج و فاسولیای خوارد کەچی پارەی یەک نەفەری دا.
عەریف فەسیلەکە زۆر پێکەنی، دەستی خستە سەر شانی و وتی: لەگەڵم وەرە تۆ لای من سەربازی نەک لێرە.
ڕووی لە من کردو پێی وتم: ئەوە چی دەڵێ؟
وتم: تۆ چەند ڕۆژە بە هەڵە لێرە لەگەڵ ئێمە دەوامت کردووە، لەمەودوا لای ئەو عەریف فەسیلە دەوام بکە.
بەم شێوەیە ئێمەی بەجێهێشت، لەو ڕۆژەش بەولاوە کەس نەبوو بەیانیان شیرو نیسکمان بۆ بێنێ، بۆیە ناچاربووین خۆمان خزمەتی خۆمان بکەین.
ماوەی سێ مانگ لەم سەربازگەیە مەشقی سەربازیان پێکردین، شەڕی عێراق و ئێرانیش تا دەهات ئاگرەکەی خۆشتر دەبوو، ئەو سەربازانەی پێش ئێمە کە ڕەوانەی بەرەکانی جەنگ کرابوون، لەو ماوەیەدا هەندێکیان کوژران و هەندێکیشیان بەدیل گیرابوون، ئەوانی تریش یان بریندار یان تۆقابوون.
شەڕێکی نەگریس بوو، میدیا جیهانییەکان زۆر بە بایەخەوە باسیان لێوەدەکرد، چەندین کەسایەتی و نێردەی نێودەوڵەتی دەستیان بە نێوەندگیری کرد، لە نێوان ئیمام خومێنی و سەدام حوسێن بۆ ڕاگرتنی شەڕوپێکدادان. بەڵام بێ سوود بوو، تا دەهات شەڕەکە گەرم و گوڕتر دەبوو.
یەکێک لەو کەسانەی کە لەو ماوەیەدا بە نوێنەرایەتی ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان هاتوچۆی بەغداد و تارانی دەکرد، ئەحمەد سیکۆتۆری بوو، هەرکاتێک دەستی بە جەولەکانی بکردبا، لێدوانی بۆ میدیاکان و کەناڵەکانی ڕاگەیاندن دەدا،

ئومێدی ڕاوەستانی شەڕی پێدەداین.
ئێمەش بە ئومێدەوە بەردەوام دەبووین لە مەشقی سەربازی و چاومان لەوە بوو شەڕەکە ڕابوەستێ و بگەڕێینەوە ناو ماڵ و منداڵی خۆمان. بەڵام گشت هەوڵەکان بێ ئەنجام بوون، چونکە هەردوو سەرکردەکە زۆر کەللە ڕەق بوون.
زۆر جار بیرم لە ڕاکردن دەکردەوە، بەڵام لەترسی گرتن و سزادان نەمدەزانی بۆ کوێ بچم و لە کوێ خۆم بشارمەوە، چونکە حکومەت سزای ڕاکردنی لە سەربازی زۆر قورس کردبوو، هەروەها لەڕێگەی دامەزراوە ئەمنییەکان و موختاری گەڕەکەکانەوە کۆنترۆڵی تەواوی شارەکانی کردبوو. بۆیە خۆشاردنەوە کارێکی ئاسان نەبوو.
مەشقی سەربازی لە کۆتایی نزیک بۆوە، ئێمەیان بەسەر سێ فەوج دابەشکرد، پێیان ڕاگەیاندین کە دوای هەفتەیەک دەمانگوازنەوە بۆ بەرەکانی جەنگ.
ئەو هەفتەیە بۆ ئێمە لە هەمووی ناخۆشتر بوو، چونکە شەڕەکە زۆر گەرم و گوڕ بوو بوو، ڕۆژانە تەرمی دەیان کوژراو لەگەڵ سەدان بریندار لە بەرەکانی جەنگ دەگەڕایەوە. وەکو وتیشم هەوڵەکانی ئەحمەد سیکۆتۆری و کەسایەتیەکانی تریش بۆ ڕازیکردنی سەدام حوسێن و ئیمام خومێنی بۆ ڕاگرتنی شەڕ بێ ئەنجام بوو. بۆیە بڕیارم دا خۆم بدزمەوە و لە سەربازی ڕابکەم.
ڕۆژێک لە ساحەی عەرەزات بووین، مەشقمان دەکرد، لەکاتی پشوودانێکی کورت، لەبەر سێبەرێک بڵاوەیان پێکردبووین. هەر لەو کاتەدا دیمەنێکی سەیر سەرنجی ڕاکێشام. هەندێک کەڵە گیا ئەو پارچە چەمەنتۆیەی کە لەسەری دانیشتبووین، شکاندبوویان و لێی هاتبوونە دەرەوە.
دیمەنی ئەو کەڵە گیایانە زۆر کاریان تێکردم، لە دڵی خۆمدا

وتــم (ئــەم کەڵــە گیایانــە بــۆ ئــەوەی هەتاویــان بەرکــەوێ، بــەم نــەرم و نیانیــەی خۆیــان، توانیویانــە ئــەم پارچــە کۆنکریتــە ئەســتوورە بشــکێنن و بێنــە دەرەوە. کەچــی ئێمــە خۆمــان بــێ ئیــرادە کــردووە و لــە ترســی گرتــن و ڕاوەدوونــان تۆقیویــن و خۆمــان تەســلیمی چارەنووســێکی نادیــار کــردووە.

ئـەو چارەنووسـەی کـە ڕوون و ئاشـکرایە، دوای چەنـد ڕۆژێکـی تـر بـۆ بەرەکانــی جەنــگ دەمانبــەن ئــەوکات یــان دەکوژرێیــن، یــان بەدیــل دەگیرێیــن، ئەگــەر بەختیــش یاوەرمــان بێــت لــە باشــترین حاڵەتیشــدا بــە برینــداری و ســەقەتی دەگەڕێینــەوە. بۆیــە بڕیــارم دا ڕابکــەم و گــوێ نەدەمــە ئەنجامەکــەی.

پێــش ئــەوەی ســافیرەی دووەممــان بــۆ لێبدرێــت و بمانبەنــەوە بــۆ ســاحەی عــەرەزات، ماڵئاواییــم لــە هاوڕێکانــم کــردو ڕامکــرد. بــەرەو تێلبەنــدی ســاحەکە چــووم، بەســەر تێلبەندەکــە کەوتــم، بەنــاو داروبارەکانــی باخچەکانــی تەنیشــت ســەربازگەکەمان بــە ڕاکــردن خــۆم گەیانــدە شــەقامە گشــتییەکە و بــە تەکســییەک چوومــە گەراجــی نەهــزە و لەوێشــەوە بــە کۆســتەر گەڕامــەوە شــاری هەولێــر.

لــە بازگــەی شــاری کەرکــوک داوای نموزەجــی ئیجازەیــان لێکــردم، وتــم: عەریــف فەســیلەکەمان یارمەتــی داوم، چونکــە هەفتەیەکــی تــر بــۆ بەرەکانــی جەنــگ دەمانبــەن، دەمــەوێ ســەردانی خانەوادەکــەم بکــەم و ماڵئاواییــان لێبکــەم. ســەربازی بازگەکــە دڵــی نــەرم بــوو، ڕێــگای پێــدام و لــە کۆســتەرەکە نەیهێنامــە خــوارەوە.

# ڕاکردن لە سەربازی

کە گەیشتمەماڵەوە، هاوسەرەکەم باوەشی پێداکردم، لەخۆشیان چاوەکانی پڕی فرمێسک بوون. کە ئەوم بەمشێوەیە بینی، دڵم ترسا، وتم: خۆ شتێکی خراپ ڕوینەداوە؟!

وتی: نەخێر، لەماوەی ڕابردو زۆر تەنیابووم هەستم بە بێکەسی دەکرد، بۆیە کە تۆم بینی بڕوام نەکرد، لەخۆشیان گریانم هات.

منیش وتم: تۆ بێکەس نیت، ئەی ماڵی باوکم لە کۆڵانەکەی بەرامبەرمان نین؟ بۆچی نەچویتە لایان؟

کە ئەمەم وت بە چاوی فرمێسکەوە وتی: خۆزگا قەت دراوسێمان نەبان.

وتم: بۆچی وا دەڵێی؟

وتی: لەجیاتی ئەوەی دڵم بدەنەوە، کە منیان دەبینی پێیان دەوتم (بۆچی دەترسێیت، خۆ هەر پیاوی تۆ نەچۆتە سەربازی، ئەی ئەوکاتە چی دەکەی کە تەرمەکەی بەکوژراوی بۆت هاتەوە؟).

منیش وتم: تۆ چیت وەڵام دانەوە؟

وتی: منیش دەستم بەگریان دەکرد، وامدەزانی بە قسەی ئەوان دەبێت، تۆ شتێکی خراپت بەسەردێت، بۆیە خۆشم نازانم ئەو ماوەیە چۆن ژیاوم.

بەدەستەکانم فرمێسکەکانیم وشک کردەوەو پێم وت: منیش دڵم لەلای ئێوە بوو، بەڵام زۆریم لەخۆم کرد و دانم بەخۆمداگرت، تاکو مەشقی سەربازیم تەواوکرد. ئێستاش ڕامکردووە و بەیەکجاری هاتوومەتەوە. ئەگەر ئەوەم نەکردبا، دەیانبردمە بەرەکانی جەنگ و لەوانەیە بکوژرابام، یان بەدیل گیرابام.

کە ئەمەم وت، هاوسەرەکەم هەناسەیەکی خۆشی هەڵمژی و بە زەردەخەنەوە وتی: ستایش بۆخوا کە گەڕایتەوە، بەیەکەوە دەژین و دەمرین، ئەوە باشترە لەوەی لە غەریبی شتێکت بەسەربێت، ئەوکات منیش بەرگە ناگرم و لە خەفەتان دەمرم.

وتم: ئەی کچەکەمان لەکوێیە، بۆچی نایبینم؟

وتی: لە ژوورەکەی تر خەوم لێی خستووە، ئێستا هەڵیدەستێنم و بۆتی دەهێنم.

منیش وتم: لێی بگەڕێ، با بۆخۆی بخەوێ، گوێم لێبگرە شتێکت پێدەڵێم.

وتی: دەتەوێ چی بڵێی؟

وتم: با نهێنی ڕاکردنەکەم تەنها لەنێوان خۆم و خۆت بمێنێتەوە، با کەس ئەمە نەزانێت، تەنانەت ماڵی باوکیشم.

وتی: لەبەر چی؟

وتم: حکومەت بڕیاریداوە ئەوکەسەی لە سەربازی ڕابکات لە سێدارەی بدات، بۆیە لای خەڵک دەڵێم تەسریح کراوم.

وتی: ئەم خەڵکە چۆن باوەڕت پێدەکەن؟

وتم: تۆ ئەمە بۆ من لێبگەڕێ، خۆم دەزانم چۆن پینەی دەکەم.

چوومە گەرماوەکە دوشێکم وەرگرت، دوایی جلی دەرەوەم لەبەرکردو چوومە ماڵی باوکم.

باوکم کە منی بینی، بە تووڕەییەوە وتی: ناکات لە سەربازی ڕاتکردبێت؟

منیش وتم: نەخێر ڕامنەکردووە، بە بڕیارێکی تایبەتی تەسریح کرام و بەیەکجاری هاتوومەتەوە.

باوکم وەک ئەوەی بڕوای بە قسەکانم نەکردبێ، سەری خۆی لەقاندو وتی: هیچ سەرم لەتۆ دەرناچێت، تا دێت شەڕەکە گەرمتر دەبێت، چۆن لە دۆخێکی وادا حکومەت تەسریحت دەکات؟

وتـم: لەبیرتـە کاتـی خـۆی لـە سـەربازی بەهـۆی چوونـە سـەرەوە تەسـریحیان کـردم، وا جارێکـی تـر گەڕانـەوە سـەر کونیەکـەم و بـە هەمـان هـۆکار تەسـریحیان کردمـەوە.
وتـی: بۆچـی کـوڕی دراوسـێکەمان وەکـو تـۆ لەسـەرەوە بـووە و تاکـو ڕێککەوتنـی جەزائیـر و هەرەسـهێنانەکەش لـەوێ بـووە کەچـی تەسـریح نەکـراوە؟
وتـم: بەشـوێن دەگوڕێـت، کاتـی خـۆی مـن لـە ئیزگـەی دەنگـی کوردسـتان بوومـە بۆیـە بڕیارەکـە تەنهـا ئـەو کەسانەی گرتۆتـەوە کـە لـە شـوێنە هەسـتیارەکان کاریـان کـردووە.
کـە ئەمـەم وت، باوکـم تۆزێـک قەناعەتـی هـات و هیـچ پرسـیاری تـری لێنەکـردم.
دوای ئـەوە، براکـەم کـە ئەندازیـاری حکومـەت بـوو، باوەشـی پێـدا کـردم و یەکتریمان ماچکرد، سـەری خستە ژێـر گوێم و بـە ئەسپایی وتـی: تـۆ بەڕاستیتە کـە لـە سـەربازی تەسریح بوویـت؟ یـان شتێک لـە ئێمـە دەشـاریتەوە؟
وتـم: نەخێـر تەسـریح نەبوومـە، مـن ڕامکـردووە، بـەڵام خـۆت دەزانـی باوکمـان کەسـێکی زۆر نیزامییـە و حـەز لـە سـەرپێچی نـاکات. ئەگـەر بـەوە بزانێـت، وەکـو سـاڵی ١٩٧٤ ئەوکاتـەی کـە لـە سـەرەوە بەسـەردان هاتمـەوە، چـۆن منـی تەسـلیمی حکومـەت کـردەوە، ئەوهـاش ئێسـتا تەسـلیمی ئینزباتخانـەی سـەربازیم دەکات.
وتـی: ئـەی چـی بـەو خەڵکـە دەڵێـی، چـۆن دەگەڕێـی، لـەوە ناترسـیت داوای دەفتـەر خدمـەت لێبکـەن و کێشـەت بـۆ دروسـتکەن؟
منیـش وتـم: تـۆ دەفتـەر خدمەکـەی خـۆت بدەبەمـن، وێنەمـان زۆر لەیەکتـری دەچێـت، ئینزباتـەکان هەسـتی پێناکـەن. ئەگـەر داوای دەفتـەر خدمەیـان لێکـردم، دەیاندەمـێ و بـا هـەر وابزانـن ئەندازیـارم و خزمەتـی سـەربازیم دواخـراوە.

وتـی: باشـه، هـەر ئێسـتا بـۆت دێنـم، بـەڵام وریابـە ئـەم نهێنییەلـە خـۆم و خـۆت بـەولاوە بـا کەسـی تـر نەیزانێـت دەنـا کێشـەت بـۆ دروسـت دەکـەن.
وتـم: خەمـی ئـەوەت نەبێـت، تەنانـەت لێناگەڕێـم هاوسەرەکەشـم ئـەوە بزانێـت.
ماوەیـەک بـەم شـێوەیە مامـەوە، ڕۆژانـە کـە دەچومـە دەرەوە دەفتـەر خدمەکـەم دەخسـتە گیرفانـم و بەبـێ تـرس دەسـووڕامەوەو سـەردانی برادەرەکانـم دەکـرد.
ئێوارەیـەک، مـەلا محەمـەدی ئامـۆزام هاتـە ماڵمـان و پێـی وتـم: فوئـادی کـوڕم وەکـو تـۆ نـاوی سـەربازی هـات، ئێسـتا لـە شـوێنێکی زۆر خراپـە. دەڵـێ هەمـوو شـەوێک دوژمـن بەسـەرمان دادەدەن، تاکـو بەیانـی لەترسـان خـەو ناچێتـە چاومـان. مامـم پێـی وتـم کـە تـۆ بەبڕیارێکـی تایبەتـی تەسـریح کـراوی، ئەگـەر ژمـارەی ئـەو بڕیـارەم پـێ بڵێـی هەندێـک کـەس لـە تەجنیـدی هەولێـر دەناسـم، داوایـان لێدەکـەم فوئـادی کـوڕم وەکـو تـۆ تەسـریح بکـەن.
منیـش هـەر لەخۆمـەوە ژمارەیەکـم پێـی وت، ژمارەکـەی لـە پارچـە کاغەزێـک نووسـییەوە و لەخۆشـییان چایەکەشـی نەخـوارد و گەڕایـەوە ماڵـی خۆیـان لـە گونـدی دارەتـوو.
دوای دوو ڕۆژ، جارێکـی تـر مـەلا محەمـەد هاتـەوە ماڵمـان، لـە دوورەوە بەپێکەنیـن وتـی: بۆچـی ئـەو ماندووبوونـەت خسـتە پێشـم و ڕاسـتیەکەت پێنەوتـم کـە تـۆش وەکـو فوئـاد لـە سـەربازی ڕاتکـردووە؟
منیش وتم: چۆن دەزانی من ڕامکردووە؟
وتـی: چوومـە تەجنیـدی هەولێـر، برادەرێکـم لەوێیـە، کـە پێـم وت تـۆ تەسـریحی، سـەری سـوڕما، سـوێندی بـۆ خـواردم کـە شـتی وانییـە. کـە نـاوی تـۆم پێـی وت، بـاش تـۆی دەناسـی، وتـی خەڵکـی یـەک گەڕەکیـن.

وتم: نائیب زابت ئەمجەد نەبێ؟
وتی: بەڵێ خۆیەتی، لاپەڕەی تۆماری تۆشی دەرهێنا، پیشانیدام، وتی (تەماشا بکە، ئەو هێشتان لای ئێمە سەربازە و تەسریح نەکراوە).
منیش وتم: من چۆن بزانم تۆ ئەوها بەوردی دەچیتە بنج و بنەوانی، دەنا هەر زوو پێم دەوتی و کێشەش بۆ من دروست نەدەبوو. ئێستا ئەویش لای برادەرەکانی ترم باس دەکات و مەترسی دەکەوێتە سەر ژیانم.
وتی: مەترسە، لای کەس باسی ناکات، ئەو خۆی بەمنی وت (ئەم قسەیەت لای من کرد، لای کەسی تری مەکە، نەوەک بزانن لە سەربازی رایکردووە، دەنا دەیگرن و دەیدەنە دادگای سەربازی و بەتوندی سزای دەدەن).
هەر لەو ڕۆژەوە ئارامیم لەبەر هەڵگیرا، دڵم زۆر دەترسا لەوەی ڕۆژێک پیاوەکانی حکومەت بەسەر ماڵمان دابدەن و وەکو چۆلەکە بمگرن و راپێچی ئینزباتخانەم بکەن. بۆیە لەترسان شەوانیش خەو نەدەچووە چاوەکانم. گوێم لە ترپەیەک بوایە، ئەشکەوتم لێ دەبووە کونە مشک و نەمدەزانی لەکوێ خۆم بشارمەوە.
زۆر جار لە ڕاکردنەکەم پەشیمان دەبوومەوە و لە دڵی خۆمدا دەموت (مرۆڤ یەک جار دەمرێت، خۆزگا ڕامنەکردبا، ئێستا هەموو ڕۆژێک لەترسی گرتن دەمرم).
پەشیمانی هیچ دادی نەدەدا، کار لەکار ترازابوو، ئەگەر خۆشم ڕادەست بکردایەتەوە هەر سزا دەدرام، چونکە داخیلی هرووب ببووم. بۆیە دانم بەخۆمدا گرت و وێرای ئەو هەموو ترس و لەرزەی کە لە دڵمدا بوو، بەسەرخۆمم نەدەهێنا و لەلای برادەرەکانم وا خۆم نیشان دەدا کە هیچ خەمم نییەو زۆر دڵخۆشم.
ئەم بارودۆخە زۆری خایاند، هەستم دەکرد دراوسێکانیشم گومانیان

لێم پەیداکردووە، کە چاوی منیان لێ ون دەبێ، لەنێوان خۆیان باسی من دەکەن. بۆیە لە ژیانی خۆم بێزاربووم، لەوە دەترسام یەکێک کەیفی پێم نەیەت، ڕۆژێک خەبەرم لێبدات و بەگرتنم بدات. بۆیە زۆر بیری سەیر بە خەیاڵمدا دەهات، بۆ دەربازبوون لەو دۆخەی کە تێیدام.

ئێوارەیەک، موختاری گەڕەکەکەمان مام فەتحی هاتە لام پێی وتم: یەکێک لە دراوسێکانت پێی وتوومە کە تۆ لە سەربازی ڕاتکردووە. نازانم ئەو کەسە ڕاست دەکات یان نا؟ بەڵام دڵنیات دەکەمەوە ئەگەر ڕاستیش بێت، لەلایەن منەوە هیچ زیانت پێناگات. بەڵام ئەگەر ڕاتکردووە، باشترە بچیتە دەرەوەی شار، دەنا ڕۆژێک هەر دێ ئاشکرابیت و ئێمەش ئەوکات هیچمان پێناکرێ.

خوا خێری مام فەتحی بنووسێ، هەر ئەو شەوە هەندێک کەلوپەلی پێویستم خستە جانتاکەم و بە هاوسەرەکەمم وت: تاکو نەیانگرتوومە، بەیانی دەچمە ناحیەی خەلیفان بۆ ماڵی خاڵم، ئەوێ ناوچەیەکی عەشایەرییە و حکومەت ناوێرێ دەستیان بۆ درێژ بکات.

هاوسەرەکەم بیرۆکەکەی بەلاوە باش بوو، وتی: منیش پێم باشە ماوەیەک لێرە دوور بکەویتەوە، ئەو خەڵکە زۆر حەسوودن، چاویان پێمان هەڵنایەت، هەموو ڕۆژێک لێم دەپرسن کە چۆن تەسریح بوویت، منیش بەناچاری درۆیان لەگەڵ دەکەم و هەمان قەوانی ڕۆژانی پێشوویان بۆ لێدەدەمەوە و دەڵێم ئەو کاتی خۆی پێشمەرگە بووە بۆیە تەسریح کراوە.

# چونم بۆ ماڵی خاڵم لە خەلیفان

لە ناحیەی خەلیفان چوومە ماڵی خاڵم، داپیرم هێشتان لەژیاندا مابوو، کە چاوی بەمن کەوت، باوەشی پێداکردم وتی: دەک چاوم کوێر بێت، لەوەتی چوویتە سەربازی دڵم هەر لەلاتە. زۆر دەترسام شتێکی خراپت بەسەربێت، بەڵام ستایش بۆ خوا کە بە سەلامەتی گەڕایتەوە ناومان.

منیش وتم: ئەو ماوەیە مەشقی سەربازییان پێکردین، هەفتەک دەبێت مەشقمان تەواوبووە و دەیانەوێ بمانبەن بۆ باشووری عێراق بۆ بەرەکانی جەنگ.

کە ئەمەم وت، دەستی بەگریان کرد وتی: لێرە کەس ناتوانێ دەستت بداتێ، هەتا شەڕ رادەوەستێ مەگەڕێوە، لەلای ئێمە بمینێوە، با شتێکت بەسەر نەیەت، دایکت بەرگەی خەفەت ناگرێت.

وتم: منیش لەبەرئەوە هاتوومە، دەمەوێ لێرە بمێنمەوە.

کە ئەمەم وت، فرمێسکی چاوەکانی خۆی سڕیەوە و وتی: چۆن لێدەگەڕێم جارێکی تر بگەڕێیتەوە سەربازی. خەمی ژنەکەشت نەبێ، لەدوای دەنێرین ئەویش بێتە ئێرە، جێگاو ڕێگایەکی زۆرمان هەیە، خوا بکات ئێوە بە ئێمە ڕازیبن، لەسەر چاوی خۆمان داتاندەنێین.

ئێمە لەو قسانەدابووین، خاڵم خدر و کوڕە پلکەکەم عەبدوڵا هاتنە ژوورەوە، خاڵم کە منی بینی باوەشی پێداکردم وتی: بەیانی زوو دوو نەفەرم بردە باتاس، کە هاتمەوە، حەمەدە سیسم لەناو بازاڕ بینی پێی وتم کە تۆی بینیوە. بۆیە بەخێرایی هاتمە ماڵەوە.

منیش وتم: کە لە کۆستەرەکە دابەزیم ئەو منی بینی، داوای لێکردم لەگەڵی بچمەماڵەوە، منیش پێم وت (بۆ ئەوە نەهاتوومە زوو بگەڕێمەوە، جارێ دەچمە ماڵی داپیرم، دوایی یەکتری دەبینین).

خاڵم وتی: ئیشێکی باشت کردووە هاتوویت بۆ ئێرە، خەڵکی ئێرە سەربازی ناکەن، ئەوانەی ناویان بۆ سەربازی دەرچووە، بەبێ ترس لەناو بازاڕ دەسووڕێنەوە و کەسیش پێیان ناڵێ لەپشت چاوتان دوو برۆیە.

بە قسەکانی خاڵم ئاسوودە بووم، خەم و خەفەتی ڕۆژانی ڕابردووم لەبیرچۆوە. شەوان تا درەنگ لە ماڵی خزمان کۆ دەبووینەوە و بە قسەی خۆش و گاڵتەو گەپ شەومان بەسەردەبرد. زۆربەی شەوان لەماڵی خاڵم دەخەوتم، هەندێک جاریش لە ماڵی پلکم حەفسەت و کوڕەکانی دەمامەوە. کە ڕۆژ دەبۆوە، ئەوان دەچونە سەر ئیش و کاری خۆیان، منیش لەگەڵ داپیرم دەمامەوە، سەربردەی پێشینانی بۆ دەگێڕامەوە.

ڕۆژانی هەینیان لەگەڵ عەبدولای کوڕە پلکم دەچووینە گەلی عەلی بەگ و تەماشای دیمەنە دڵڕفێنەکەی تاڤگەکەم دەکرد، لە چایخانەکەش چایەکی گەرممان دەخواردەوە و دواییش بە پێ دەگەڕاینەوە خەلیفان.

خاڵم و کوڕە پلکەکانم بەڕۆژ خەریکی کاسبی بوون، بۆیە کاتم لێ نەدەڕۆیشت و بێزار دەبووم. لە بێزارییان بیرم کردەوە ئیشێک بکەم و کاتی خۆمی پێ بەسەرببەم.

چەند مانگێک بوو، سەدام حوسێن لەکاتی هاتنی بۆ خەلیفان بڕیاری دابوو، لەسەر بودجەی حکومەت خانووەکانی شارۆچکەی خەلیفان نۆژەن بکرێنەوە و بە دیزاینێکی نوێ سەرلەنوێ دروستبکرێنەوە. مستەفای کوڕە پلکم تاکە دارتاش بوو لە

خەلیفـان، بۆیـە ئیـش و کاری زۆر بـوو، قالبـی بـۆ خانـووەکان دەبەست، عەبدوڵای برا بچووکەکەشی بەردەستی دەکردو یارمەتی دەدا.
ڕۆژێـک کـوڕە پلکەکـەم مسـتەفا بـۆ خوانـی نیـوەڕۆ منـی لەگـەڵ خـۆی بـردەوە، لەکاتـی نانخـواردن، بیرۆکەیـەک بەخەیاڵـمـدا هـات، پێـم وت: تـۆ زۆربـەی ئیـش وکارەکانـی قالبـی داربەسـتن بەخـۆت دەکەیـت، عەبـدوڵا تەنهـا بەردەسـتیت بـۆ دەکات، ئەگـەر ئەویـش نەبێـت، کەسـێکی تـر دەتوانـێ هاوکاریـت بـکات.
وتـی: ڕاسـتە، ئیـش وکاری مـن لەسـەر ئـەو ڕانەوەسـتاوە، ئەویـش نەبێـت، هەرکەسـێکی تـر بێـت، دەتوانـێ بـۆم بـکات. بـەڵام تێنەگەیشـتم مەبەسـتت لـەم قسـەیە چییـە؟
وتـم: ئەوەنـدی لەماڵـی داپیـرم بەتەنیـا بمێنمـەوە زۆر بێـزار بوومـە، ئێـوە هـەر هەمووتـان بەیانیـان تاکـو ئێـوارە لەسـەر کارن، بۆیـە بیـرم لـەوە کردۆتـەوە ئەگـەر تـۆ ڕێـگا بدەیـت عەبـدوڵا کارم لەگـەڵ بـکات، هەندێـک داری قالـب دانـان دەکـڕم و خۆمـی پێـوە خەریـک دەکـەم.
مسـتەفا بیرۆکەکـەی بـەلاوە بـاش بـوو وتـی: هـەر کاتێـک تەختـە و دارت کـڕی، ئـاگادارم بکـەوە، عەبـدوڵا دەنێرمـە لات بـا قالبـی خانووەکانـت لەگـەڵ ببەسـتێ.
هـەر ئـەو ڕۆژە گەڕامـەوە شـاری هەولێـر. کـە چوومـە ماڵـەوە، کـە هاوسـەرەکەم منـی بینـی، هـەر لـە دوورەوە دەسـتی بـە گریـان کـرد وتـی: زۆر بیـرم کردوویـت، ئێمـە لەدووریـی تـۆ ژیانمـان زۆر ناخـۆش بـوو، لـە خەفەتـان نازانـم چـۆن شـەوو ڕۆژم لێـدەڕوات.
تەماشایەکی شەقامەکەی کرد وتی: دراوسێکان تۆیان بینی؟
وتم: بۆچی وادەڵێی؟
وتـی: لـەو ڕۆژەی کـە تـۆ ڕۆیشـتووی، دەنگـۆی ڕاکردنـت لەنـاو گەڕەکەکەمـان بـڵا و بۆتـەوە، باوکیشـت زۆر دەترسـێت نـەوەک

بەهـۆی ڕاکردنـی تـۆ ئێمـە و ئـەوان بگـرن.
منیـش وتـم: ئـەو خەڵکـە چـی دەڵـێ بـا بۆخـۆی بیڵێـت، گـوێ مـەدە قسـەی کـەس. دەمـی خەڵـک کونـە دیوارێـک نییـە تـا تۆپەڵـە خوریێکـی لەنـاو نێیـن و بیگریـن.
زۆر برسـیم بـوو، بۆنـی دۆڵمـە دەهـات، چوومـە لای تەباخەکـە، مەنجەڵێک دۆڵمەی لەسەر بوو. کە سەری مەنجەڵەکەم هەڵدایەوە، دەتـوت دۆڵمەکـە خـەوی لێکەوتـووە، چـۆن ئامـادە کرابـوو، بەبـێ دەسـکاری لەشـوێنی خـۆی مابـۆوە. ڕووم لـە هاوسـەرەکەم کـرد، پێـم وت: بۆچـی هیچـت لـەم دۆڵمەیـە نەخـواردووە؟
کە ئەمەم وت، لە پرمەی گریانی دا.
وتم: دەڵێی شتێک بووە کە من نایزانم؟
وتـی: سـەعاتێک پێـش ئێسـتا قاسـمی بـرام لـە کۆیـەوە هاتـە لامـان. دواڕۆژی ئیجازەکـەی بـوو، دەگەڕایـەوە وەحدەکـەی خـۆی لـە بسـێتین. منیـش پێـم وت (هەندێـک خـۆت دوابخـە، نانێکمـان لەگـەڵ بخـۆ، ئەوجـا بگەڕێـوە شـوێنی خـۆت). ئـەو زۆر پەلـەی بـوو، وتـی (ناتوانـم لەوەنـدە زیاتـر خـۆم دوابخـەم، دەنـا فریـای گەڕانـەوە ناکـەوم).
لـە درێـژەی قسـەکانیدا وتـی: زۆر خەفەتـم بـۆی خـوارد، زۆری حـەز لـێ بـوو، بـەڵام دۆڵمەکـە بەتەواوەتـی نەکوڵابـوو. زۆر هەوڵـم لەگەڵیـدا کـە هەندێـک خـۆی دوابخـات و نانمـان لەگـەڵ بخـوات، کـە زانـی خەفـەت دەخـۆم، لەبـەر دڵـی مـن سـەری مەنجەڵەکـەی هەڵدایەوەو پەلکە زڵقێکی خوارد وماڵئاوایی لێکردین و گەڕایەوە.
منیش وتم: بۆچی هێشتت بگەڕێتەوە ناو ئەو ئاگرە؟
وتـی: زۆر هەوڵـم لەگەڵـی دا، پێمـوت (مەگەڕێـوە، تـۆش دەنێرمـە لای هاوسـەرەکەم لـە خەلیفـان. خەڵکـی ئـەوێ عەشـایەرین، حکومـەت ناوێـرێ دەسـتیان بـۆ درێژبـکات).

وتم: ئەو چی وت؟
وتی: پێی وتم (جارێ شوێنەکەمان باشە، زۆر مەترسی هێرشی ئێرانی لەسەر نییە، بەڵێنت پێدەدەم ئەگەر جارێکی تر بگەڕێمەوە منیش ڕادەکەم و دەچمە لای باوکی ژاڵە).
بەهەرحاڵ، زۆر دڵیم دایەوە، ئەوجا لەسەر خوان لەگەڵم دانیشت و بەیەکەوە چێشتمان خوارد.
دوای نانخواردن پێی وتم: ئەگەر دەوامی قوتابخانەم نەبوایە، منیش لەگەڵت دەهاتم تاکو لەبەر ئێمە هێندە خۆت لەم ڕێگا پڕ مەترسییە نەدەیت.
وتم: ڕاست دەکەی، منیش پێم باش نییە هێندە لەو ڕێگایە بێم و بچم، بەڵام ئەمجارە بۆ کڕینی تەختە و دەرسەک و کەرەستەی قالبی دارتاشی هاتوومەتەوە. بەیانی دەچمە شوێنی فرۆشتنی دار و تەختە، هاوڕێیەکم ناوی محەمەد عەباسە، لە قوتابخانە بە یەکەوە خوێندومانە، ئێستا لەوێ کار دەکات، داوای لێدەکەم یەک لۆری تەختە و دار و پێداویستییەکانی قالبی دارتاشیم بۆ دابین بکات.
هاوسەرەکەم قسەکانی منی بەلاوە سەیر بوو، بەسەرسوڕمانەوە وتی: خوا نەبێ کەس سەری لە تۆ دەرناچێ، پێم نالێی تۆ چیت، سەربازیت یان دارتاشیت؟!
وتم: تۆ ڕاست دەکەی، ناچارم ئەوە بکەم، خەڵکی ئەوێ بەڕۆژ دەچنە سەر کار و بەشەویش دەگەڕێنەوە. زۆر بێزار بووم هەندەی لەبەیانییەوە تاکو ڕۆژئاوا بەتەنیا لە کونجی ژوورێک دانیشم.
وتی: جا دەتەوێ چی لەو تەختە و دارانە بکەیت؟
وتم: دەمەوێ لەجیاتی دانیشتن، خۆم بە ئیش وکاری دارتاشی خەریک بکەم.

وتی: تاکو دەگەڕێیتەوە زۆر ئاگات لەخۆت بێت، مەهێڵە دراوسێکان و هاوڕێکانت بتبینن، نەوەک هەواڵت لێبدەن و بە گرتنت بدەن؟
منیش وتم: خەمت نەبێ بەیانی زوو کە لێرە دەچمە دەرەوە، ڕاستەوخۆ دەچمە لای ئەو هاوڕێیەم و تەختە و دار و پێداویستییەکانی دارتاشی دەکڕم، هەر لەوێش بە لۆرییێک دەیانبەمەوە خەلیفان.
ئەو ڕۆژەم بەڕێ کرد، بەیانیش زوو چوومە لای هاوڕێکەم لە دەزگای فرۆشتنی دارو تەختە. هاوڕێیەکەم کە سەیری دەموچاوی کردم، هەستی کرد لە سەربازی ڕامکردووە و خەریکی کارێکم، بەڵام هیچ پرسیاری لێ نەکردم. وتی: هەرچەند ئەو بڕە دارو تەختەیەی کە تۆ داوای دەکەیت، یەکجار زۆرە، بەڵام بۆتی دابین دەکەم.
بەم شێوەیە، بە سێ سەد دینار دار و تەختە و کەرەستەی دارتاشیم کڕی و بە لۆرییێک بردمەوە خەلیفان.
کە گەیشتمە ئەوێ، مستەفای کوڕە پلکم کە چاوی پێکەوت، سەری سوڕما، وتی: لەو باوەڕەدا نەبووم ئەو هەموو تەختەیەت دەسکەوێت، چونکە بەهۆی شەڕی عێراق و ئێرانەوە دەمێکە حکومەت هاوردەکردنی تەختەی ڕاگرتووە.
منیش وتم: ڕاستە، ئەگەر لەبەر محەمەد عەباسی هاوڕێم نەبوایە منیش ئەم بڕە زۆرەم پێ دابین نەدەکرا، بەڵام بە سوپاسەوە ئەو هاوڕێیەم دەتوت هەستی کردووە لە سەربازی ڕامکردووە و بەدوای کارێکم بۆیە بۆی دابین کردم.
هەر ئەوکات، مستەفا بانگی عەبدوڵای کردو پێی وت: لە بەیانییەوە لەگەڵ ئەو ئیش بکە، منیش کەسێکی تر بۆ خۆم پەیدا دەکەم.

ڕووی لەمنیش کرد و پێی وتم: لەسەر فەرمانی سەدام حوسێن خانووەکانی ناحیەکەمان هەمووی نۆژەن دەکرێنەوە، وەزارەتی نیشتەجێبوون خەرجییەکان دەگرێتە ئەستۆ و پارەکەی دەدات، بۆیە ئیش وکار زۆرە خەمتان نەبێت.

سوپاسگوزاری بووم پێموت: مەبەستم لەم کارە، پارە کۆکردنەوە نییە، ناشمەوێ کێبڕکێی تۆ بکەم، لە تەنیایی زۆر بێزار بوومە، تەنها دەمەوێ کات بەسەرببەم.

ڕووم لە عەبدوڵا کرد پێموت: ئەگەر پێت باش بێت، هەر لە ئێستاوە ببە هاوبەشم لەو تەختەو دارانە. ئێستا هیچ پارەم لێت ناوێت، کە ئیشمان کرد، هەتا پارەکەی پڕ دەکەیتەوە، هیچ پارەت نادەمێ. دوای ئەوە تۆش وەکو من دەبیتە خاوەنی نیوەی ئەو تەختە و دارانە.

کە وام وت، زۆری پێخۆشبوو، وتی: تۆ لە مستەفای برام بۆمن باشتری، ئەوە چەند ساڵێکە لەگەڵ ئەو ئیشی تەختەبەستن دەکەم، کەچی ڕۆژێک ئەوەی بەخەیاڵدا نەهات هەر بە گاڵتەش پێم بڵێ ببە هاوبەشم.

منیش وتم: ئەگەر مستەفای براشت نەبوایە، تۆش فێری تەختەبەستن نەدەبوویت و منیش نەمدەتوانی ئەم داوایەی لێبکەم.

کە وام وت: مستەفا ڕووی تێکردم وتی: تۆ خۆت بەم قسانەوە خەریک مەکە، ئەو گەنجە، دەیەوێ بە شەوو ڕۆژێک وەکو منی لێبێت، بۆیە گلەییم لێدەکات.

ئێمە لەو قسانەدابووین، نەجیمی هاوسەری کچە پلکەکەم بەژوورکەوت، دوای سڵاوکردن، ڕوی لەمن کردو وتی: بیستوومە تەختە و دارت هێناوەو قالبی خانوو دەبەستیت؟

وتم: ئەوە ڕاستە.

وتی: خانووەکەم بۆ ببەستن، هەقیشتان چەندە دەتاندەمێ.
مســتەفا ڕووی تێکــردم وتــی: ئــەی نەمــوت ئیــش زۆرە، ئەوجــا هــەر یەکــەم خانووتــان زەحمەتــە دوای ئــەوە شــارەزای ئیــش و کارەکەتــان دەبــن و خەڵکەکــەش دەتانناســن و ڕووتــان تێدەکــەن.
منیــش وتــم: بــۆ هــەر خانووێــک چەنــد وەربگریــن بــۆ دەســتهەقی خۆمــان؟
وتــی: نەخشــەی هەمــوو خانــووەکان وەکــو یەکــە، بۆیــە بــۆ هــەر خانووێــک ســەدو پەنجــا دینــار وەربگــرن. ئەگــەر یەکێکیــش شــتی زیاتــری لــێ داواکــردن، ئێــوەش بەقــەد ئــەوە پــارەی زیاتــری لێوەرگــرن.
کــە وای وت، نەجیــم دەســتی بــردەوە گیرفانــی و ســەدو پەنجــا دینــاری دەرهێنــا و دایــە دەســتم وتــی: هــەر لــە ئێســتاوە پــارەی خــۆم دەدەم، بــا لەســەرم نەمینــێ.
منیــش پارەکــەم لێــی وەرگــرت و ڕووم لــە عەبــدوڵا کــرد پێمــوت: عەبــدوڵا مــن ســێ ســەد دینــارم بــەو تەختــەو دارانــە داوە، لــە بەســتنی خانــووی نەجیــم بەشــت نــادەم، بەبــەر قەرزەکەتــی دەخەمــەوە، دوای بەستنی دوو خانــوو ئینجــا تــۆ دەبیتــە هاوبەشــم و هیــچ قــەرزت لەســەر نامێنــێ.
کــە وام وت، مســتەفا ڕووی لــە عەبــدوڵا کــرد و پێــی وت: چیــت دەوێ وا بوویتــە خاوەنــی تەختــەو داریــش؟
عەبدوڵاش وتــی: خێــری تێدابــوو ئــەو لــە ســەربازی ڕایکــرد و هاتــە ئێــرە، دەنــا هــەر لەبــەر دەســتی تــۆ بــە شــاگردی دەمامــەوە و نەدەبوومــە خاوەنــی تەختــە و داری خــۆم.
تاکــو ماوەیــەک لــە خەلیفــان تەختــەم بەســت، پارەیەکــی زۆرم دەســکەوت، لــە ئیــش وکاری دارتاشــی و قالــب بەســتنیش شــارەزا بــووم. بــەڵام دوایــی ناچــار بــووم ئــەوێ بەجێبهێڵــم و بچمــە ماڵــی

پلکم لـه گونـدی مالمـن لەسـەر زێـی گـەوره لـە نزیـک گونـدی شـانەدەر.
ئێوارەیەکـی درەنـگ هاوسـەرەکەم هاتـە خەلیفـان بـۆلای مـن، کـە منـی بینـی دەسـتی بەگریـان کـردو وتـی: دایـەرەی ئەمـن باوکتیـان ئـاگادار کردۆتـەوه، ئەگـەر خـۆت ڕادەسـت نەکەیـت، لەجیاتـی تـۆ ئـەو دەگـرن و دەیخەنـە بەندیخانـە.
باوکیشـت بەمنـی وت: ئەگـەر خـۆی ڕادەسـتی حکومـەت نەکاتـەوه و نەگەڕێتـەوه سـەربازی، ناچـارم شـوێنەکەی بـە حکومـەت بڵێـم. لەجیاتـی ئێمـە بچینـە ژوورەوه بـا ئـەو بگـرن.
منیش وتم: تۆش خۆشبڕوا بو بیت، بڕوات پێیکرد؟
بەچـاوی گریانـەوه وتـی: هـەر بۆئـەوەی مـن خەفـەت بخـۆم، دایـک و باوکـت هەمـوو شـتێک دەکـەن. بۆیـە ناگەڕێمـەوه تاکـو بەڵێنـم پێنەدەیـت کـە ئێـرە بەجێدەهێڵیـت و دەچیتـە ماڵـی پلکـت لـە گونـدی مالمـن.
لەگـەڵ هاوسـەرەکەم ئـەو شـەوەمان بەیەکـەوه بەسـەربرد، بـۆ بەیانـی ئـەو گەڕایـەوه هەولێـرو منیـش جانتاکـەم هەڵگـرت و بـە پیکابێـک چوومـە گونـدی مالمـن.
گونـدی مالمـن لەسـەر زێـی گـەوره کـە بـە زێـی بادینـان نـاوی دەرکـردووه، تەنهـا پێنـج ماڵـی لـێ دەژیـا. یەکێـک لـەو ماڵانـە خوشـکی دایکـم بـوو، لـەو ڕۆژەی کـە مێـردی کردبـوو کەوتبـووه ئـەو دەڤـەره. ئـەو شـوێنە لـەلای حکومـەت بـە ناوچـە قەدەغەکـراوەکان نـاوزەد کرابـوو. دوای هەرەسـی شۆڕشـی کـورد، حکومـەت یەکـە ئیدارییەکانـی لـە هەندێـک ناوچـەی کوردسـتان کشـاندەوه و نـاوی لێنـان ناوچـە قەدەغەکـراوەکان. بۆیـە نەدەبـوو خەڵـک لـەو شـوێنانە نیشـتەجێ بێـت. بـەڵام ماڵـی پلکـم و چەنـد خانەوادەیەکـی تـر لـەو گونـدە مابوونـەوه، ڕەز و باغیـان هەبـوو، هەروەهـا ئاژەڵیـان بەخێـو

دەکرد. هەندێک لەو خانەوادانە وێڕای ئەمە، بیستانی شفتی و گندۆرەشیان هەبوو.
ئەو گوندە، هەرچەندە شوێنێکی دواکەوتوو بوو، بەڵام خەڵکەکەی سادەو ساکارو دڵفراوان بوون. ڕێزێکی زۆریان لێدەنام، زۆربەی کات بۆ نانخواردن دەعوەتیان دەکردم. هاوسەری پلکەکەم لە دامەزراوەیەکی حکومی لە خەلیفان پاسەوان بوو. مانگی جارێک بەسەردان دەهاتەوە، کاتەکانی تر لەماڵی کوڕە گەورەکەی لە خەلیفان دەمایەوە.
بەیانیان کە لە خەو هەڵدەستامەوە، دوای نانخواردن، ڕادیۆیەکی بچووکم لەگەڵ خۆم دەبردو دەچومە سەر زێ، تاکو نیوەڕۆ نەدەگەڕامەوە.
مەلەوانیم نەدەزانی و زۆریش لە ئاوی زێ دەترسام، بۆیە هەوڵی مەلەکردنم نەدەدا، هەرچەند زۆربەی ڕۆژەکان جلەکانم دادەکەندو بە شۆرت و فانیلەیەک دەچوومە ناو تەنکاوەکانی زێیەکە.
ڕۆژێک لەناو تەنکاوەکە بووم، کۆمەڵێک ماسی گەورەم بینی بەسەر ئاوەکە کەوتبوون، شەپۆلی ئاوەکە بەرەو لای منی دەهێنان.
ماوەیەکی زۆر بوو گۆشتم نەخواردبوو، زۆریش حەزم لە گۆشتی ماسی بوو، بۆیە هەندێک سەرکێشیم کرد، لە ماسییەکان چوومە پێشەوەو دەستم بۆ درێژکردن، سێ ماسی گەورەم گرت.
لە ئاوەکە هاتمە دەرەوە و بەخۆم و ماسییەکان گەڕامەوە ماڵی پلکم. پلکم کە چاوی بە ماسییەکان کەوت، وتی: چما تۆ مەلەوانی دەزانی؟
منیش وتم: نەخێر نایزانم.
وتی: ئەی چۆن توانیت ئەو ماسییانە بگریت؟
وتم: ئازایەتی خۆم نەبوو، کۆمەڵێک ماسی بەسەر ئاو کەوتبوون،

شــەپۆڵەکانیش بــۆلای منیــان هێنــا و منیــش دەســتم درێــژ کــرد گرتمــن.
پلکـم وتــی: یــەک مەنجــەڵ دۆڵمــەم بــۆت لێنــاوە، دەزانــم زۆر حــەزت لێیەتــی، جەمــی نیــوەڕۆ دۆڵمــە دەخۆیــن، ئێــوارەش ئــەو ماســییانەت لەســەر پشــتی ســێڵ بــۆ دەبرژێنــم.
بــەم شــێوەیە، ئــەو ئێوارەیــە پلکـم ماسـییەکانی برژانـد. بانگـی حـارس و عەلــی و وسووشــی کردبــوو بــۆ نانخــواردن. ئــەوان هەرســێکیان خەڵکـی گوندەکـە بـوون. کـە چاویـان بـە ماسـییەکان کـەوت، سـەریان سـوڕما، کــە چــۆن ئــەو ماســییە گەورانــەم پێگیــراوە. پێــش ئــەوەی وەڵامیـان بدەمـەوە، پلکـم بـە پێکەنینـەوە ڕووداوەکـەی بـۆ گێڕانـەوە.
هێشــتان دەســتمان لــە نانخــواردن هەڵنەگرتبــوو، ســێ پێشــمەرگە بەژوورکەوتــن و ســڵاویان لێکردیــن. پلکـم داوای لێکـردن کـە ئەوانیـش لەســەر خوانەکــە دابنیشــن و ماســیمان لەگــەڵ بخــۆن،
وتــی: ئەمــڕۆ کــوڕە خوشــکەکەم کاتێــک لــەدەم زێیەکــە بــووە، شــەپۆلی ئاوەکــە ئــەم ماســییانەیان بــۆلای ئــەو هێنــاوە و ئەویــش گرتوونــی و لەگــەڵ خــۆی هێناوینیەتــەوە.
هــەر ســێ پێشــمەرگەکان لــە قاقــای پێکەنینیــان دا، یەکێکیــان وتــی: نیــوەڕۆ لــە گونــدی شــانەدەر قونبەلەمــان فڕێدایــە نــاو زێیەکــە و هەندێــک ماســیمان گــرت، ئەوانــی تریــش لەگــەڵ شــەپۆلی ئاوەکــە ڕۆیشــتن و پێمــان نەگیرانــەوە. نۆشــی گیانتــان بێــت، ئێمــە نیــوەڕۆ زۆرمــان خــواردووە و دڵمــان نایبــات.
هــەر لــەو کاتــەدا بیرۆکــەی چونــەدەرەوەی وڵاتــم بــە خەیاڵــدا هــات. ڕووم لــە پێشــمەرگەکان کــرد، وتــم: ئێــوە لەکوێــوە هاتــوون و بــۆ کــوێ دەچــن؟
یەکێــک لــە پێشــمەرگەکان وتــی: ئێمــە لەنــاو خاکــی ئێرانــەوە هاتوویــن، لەنـاو خاکـی عێـراق ئەرکێکمـان پێسـپێردراوە، جێبەجێـی

دەکەیــن و دەگەڕێینــەوە.
منیش وتم: دەتوانم داوای شتێکتان لێبکەم؟
وتی: ئەگەر پێمان بکرێت، چی تیایە؟
وتــم: دەمــەوێ لەگەڵتــان بێمــە ئێــران و لەوێشــەوە بچمــە دەرەوەی وڵات.
ئەویش وتــی: لــە گەڕانەوەمــان، بەنــاو خاکــی تورکیــا دەگەڕێینــەوە ئێــران.
منیش وتم: باشتر، کەواتە تاکو تورکیا لەگەڵتان دێم.
وتی: دەڵێی لە سەربازی ڕاتکردووە؟
وتــم: بەڵــێ وایــە، وەحدەکەمــان گوازراوەتــەوە بــۆ بەرەکانــی جەنــگ لــە باشــووری عێــراق، بۆیــە ڕامکــرد.
پێشــمەرگەکە ڕوی لــە پلکــم کــردو پێــی وت: ئــەو کــوڕە دەبێتــە چــی تــۆ؟
پلکم وتی: کوڕی خوشکمە، لە شاری هەولێر دادەنیشن.
پێشــمەرگەکە ڕووی تێکردمـــەوەو وتـــی: خـــۆت ئامادەبکـــە، دوای هەفتەیەکــی تــر دەگەڕێینــەوە ئێــرەو لەگــەڵ خۆمــان دەتبەیــن. دوای ئــەوەی چایەیــان لەگــەڵ خواردینــەوە، دواتــر ماڵئاواییــان لێکردیــن و ڕۆیشــتن.
نامەیەکـــم بـــۆ هاوســـەرەکەم نووســـی و دامـــە دەســـت پلکـــم، پێمــوت: بەکەســێک ئــەم نامەیــەم بــۆ هاوســەرەکەم بنێــرە، تیایــدا داوام لێیکــردووە کــە ئەویــش بێــت، هەموومــان بەیەکــەوە عێــراق بەجێدەهێڵیـــن و دەچینـــە دەرەوەی وڵات.
کــە ئەمــەم وت پلکــم دەســتی بەگریــان کــرد، بەچــاوی فرمێســکەوە زۆر لێــم پاڕایــەوە کــە واز لــەم بیرۆکەیــە بێنــم و بەجێیــان نەهێڵــم. دوای چەنــد ڕۆژێــک هاوســەرەکەم خــۆی و ژاڵــەی کچــم هاتنــە گونــد و باوەشــمان بەیەکــدا کــرد و یەکتریمــان ماچکــرد.

هاوسەرەکەم بیرۆکەی چوونە دەرەوەی وڵاتی پێ باش نەبوو، بەڵام بەناچاری قبوڵی کرد وتی: هەرچەند چوونەدەرەوەی وڵاتم پێباش نییە، چونکە خوا دەزانێ لەو ڕێگایە چیمان بەسەردێت. بەڵام دڵت ناشکێنم و لەگەڵت دێم، منیش لە ژیانی تەنیایی بێزار بوومە، تۆ نازانی لەوەتی تۆ لێمان دوورکەوتوویتەوە، دایکت چەند کێشەی بۆ دروست کردوومە.

وتم: تۆ باسی چی دەکەی؟

وتی: لەو ڕۆژانە سیروان و ڕەوەندی برام لە کۆیەوە هاتبوونە لام، گولیزاری ژنی زراریش لەبەر دەرگا ئەوانی لەگەڵ من بینی، بەبێ ئەوەی لێم بپرسێت ئەوانە چی تۆنە، بۆ دایکتی گێڕابۆوە. ئەوەندەم زانی داکت و خوشکەکانت هاتنە سەرم، چی خراپە پێیانکردم و لەلای دراوسێکان ئابڕوویان بردم، پێی وتم (کوڕەکەم لەبەر سەربازی ڕایکردووە، تۆش هیچ شەرم لەخۆت ناکەیتەوە و خەڵکی بێگانە دەهێنیتەماڵەوە).

منیش وتم: زۆر سەیرە، قەت چاوەڕێی ئەو ڕەفتارە خراپەم لە دایکم نەکردووە. ئەی تۆ چیت وت؟

وتی: خوا بەزەیی بەمن هاتەوە، ئەوان هێشتان هەر لە ماڵمان بوون. بانگم کردن وتم: بزانن خەسووم چی لێتان دەوێ؟

کە دایکت چاوی بە براکانم کەوت، لە شەرمەزارییان هیچ قسەی پێنەکرا، سەری خۆی شۆڕ کردو بەجێی هێشتین.

منیش وتم: تۆش چیت پێی نەوت؟

وتی: دایکت کە براکانمی بینی ئەوانی دەناسی، لەبەردەم ژنەکانی دراوسێمان تفێکی لەڕووی گولیزار کردو پێی وت: ئەگەر تۆ ئەو بوختانەت بە بووکەکەم نەکردبا، منیش شەرمەزار نەدەبووم.

کە هاوسەرەکەم ئەمەی بۆ گێڕامەوە، زۆر خەفەتم خوارد، دڵم دایەوەو پێموت: هیچی تر خەفەت مەخۆ، جارێکی تر

لێناگەڕێم تەنیا بیت، قاچم لەسەر قاچەکانت دەبێت و بۆ کوێ بڕۆم لەگەڵ خۆم دەتانبەم.
هەتا پێشمەرگەکان گەڕانەوە، هاوسەرەکەم هەر لەلای من مایەوەو نەگەڕایەوە هەولێر. هەر لەو ماوەیەدا، هەموو ڕۆژێک بەیەکەوە دەچووینە ناو باخچەی ماڵی پلکم. لە دەم زێیەکە باخچەیەکیان هەبوو، تەماتەو باینجان و کوولەکەو سەوزەیان لێی دەچاند. کانیێکی بچکۆلانەش لەناو باخچەکە بوو، باخچەکەیان پێی ئاو دەدا.
تاکو نیوەڕۆ بەیەکەوە لەناو باخچەکە دادەنیشتین، باسی ژیانی تەنیایی خۆی بۆمن دەگێڕایەوە، منیش باسی ژیانی گوندم بۆی دەکرد.
هاوسەرەکەم هەرچەند کەسێکی شارستان بوو، وەکو من لە گوند نەژیابوو، بەڵام بەم چەند ڕۆژە کەمە لە ژیانی گوند ڕاهات و زۆری پێخۆشبوو.
هەموو جارێک دەیوت: ئەگەر لەبەر وەزیفەکەم نەبێت، شەڕیش ڕابووەستێت، جارێکی تر ناگەڕێمەوە شار و بۆخۆمان لێرە ژیان بەسەردەبەین.
بەهەرحاڵ ئەو هەفتەیە تێپەڕی و پێشمەرگەکان گەڕانەوە گوند و هاتنە ماڵی پلکم. پێش ئەوەی من قسەیان لەگەڵ بکەم، پلکم ئەوانی بردە ژێر کەپرەکەو هەندێک پسەپسی لەگەڵ کردن. منیش لە پەنجەرەی ژوورەکە سەیرم دەکردن، نەمزانی باسی چی دەکەن.
دوای تۆزێک هاتنە ژوورەوە، بەرپرسەکەیان پێی وتم: پلکت دەڵێ (هاوسەر و منداڵەکەشی لەگەڵ خۆی دەهێنێ) ئەمە وایە؟
منیش وتم: بەڵێ، ئەوانیش وایان پێخۆشە کە بەتەنیا بەجێیان نەهێڵم، بۆیە ئەوانیش لەگەڵم دێن.

ئەویش وتی: ئێمە لەسەر ئەوە ڕێک نەکەوتبووین، بڕیار بوو تۆ بەتەنیا لەگەڵ ئێمە بێیت.
وتم: جیاوازی چییە، من تەنیابم یان ئەوانیشم لەگەڵ بێت؟
وتی: ئەو ڕێگایەی کە ئێمەی پێدا دەڕۆین، زۆر مەترسیدارە. ئەو منداڵە شیرەخۆرەشتان دەمی ناگیرێت، ئەگەر بگرییێت، جەندرمەکانی سنوورمان لێ وەئاگا دەهێنێت و سەرمان دەخوات.
منیش وتم: ناشکرێت خۆم و هاوسەرەکەم بێین و ئەو منداڵە شیرەخۆرەیە لێرە بەجێبهێڵین.
یەکێک لە پێشمەرگەکان پێی وتم: ئێمە لەو گەشتەمان بۆ ناو خاکی تورکیا بەتەنها نین، هەندێک قاچاخچیمان لەگەڵدایە، ئەوان شارەزای ئەو چیا وچۆڵەن، پێیان خۆش نییە ژن و منداڵمان لەگەڵ بێت. چونکە منداڵ کۆنترۆڵ ناکرێت و گریانی جەمودەمی نییە، ئێمەش لەو گەشتەماندا بە نێوان دوو سەنگەری سەربازی عێراقی دا دەڕۆین، ئەگەر لەو کاتەدا منداڵەکان بگرییێن و بێدەنگ نەکرێن، ئەوا لەبەر سەلامەتی خۆیان دەیانخنکێنن.
کە ئەمەی وت، پێش ئەوەی من قسە بکەم، هاوسەرەکەم ژاڵەی لەئامێز گرت و بە تووڕەبییەوە وتی: ئەو منداڵە ژیانی منە، چۆن دڵم دێت چارەنووسی بخەمە بەردەستی ئەم گورگانە.
ڕووی لە منیش کردو پێی وتم: ئەگەر حەزدەکەی تۆ بەتەنیا لەگەڵیان بڕۆ، منیش دەگەڕێمەوە هەولێرو لەدوو دایک و باوکم دەنێرم، داوایان لێدەکەم خەمێکم لێبخۆن.
منیش وتم: چۆن دڵم دێت ئێوە جێبهێڵم و بەتەنیا لەگەڵیان بچم. ئەمە گەشتێکی یەک دوو ڕۆژی نییە، تاکو بڕیارێکی لەو شێوەیە بدەم. ژیانی منیش لەگەڵ ئێوە دەبێت.
ڕووم لە پێشمەرگەکان کرد و پێم وتن: سوپاستان دەکەم بۆ هەموو شتێک، بەڵام من ناتوانم ژن و منداڵەکەم جێبهێڵم.

گەورەی پێشمەرگەکان وتی: بڕیارێکی دروستت داوە، هەر چۆنێک بێت لێرە بمێنیتەوە لە دوورە وڵاتی باشترە.
وەرزی هاوین بوو، زۆری مابوو دەوامی قوتابخانە دەست پێبکاتەوە، بۆیە هاوسەرەکەم نەگەڕایەوە شار، لای من مایەوە.
ئەو هاوینەمان زۆر بەخۆشی بەیەکەوە بەسەربرد، دوای نانخواردنی بەیانیان بەیەکەوە دەردەچووین، ترمسێک چای گەرممان لەگەڵ خۆمان دەبرد و دەچووینە دەم زێیەکە و تاکو نیوەڕۆ نەدەگەڕاینەوە ناو گوند.
لەبەرچاوم ئەو ماوەیە زۆ بەخێرایی ڕۆیشت، لە خۆشییان لەیادم کردبوو کە لە سەربازی ڕامکردووە، تەنانەت هەستیشم بەوە نەدەکرد کە ڕۆژێک لە ڕۆژان لە شار نیشتەجێ بوومە، دەتوت لەوەتی بوومە هەر لە گوند ژیاوم، ژیانی شارم لەبیر چووبۆوە.
کە دەوامی قوتابخانە دەستی پێکردەوە، دەبوو هاوسەرەکەم بگەڕێتەوە شار و لە قوتابخانەکەی دەست بەکار بکاتەوە یانیش واز بێنێت و لەگەڵ من لەگوند بمێنێتەوە.
بەدرێژایی شەو بیرم لەوە دەکردەوە چ بڕیارێک لەو بارەیەوە بدەین، خەو نەچووە چاوەکانم. تەنانەت هاوسەرەکەشم وەکو من دوودڵ بوو، تاکو بەیانی ئەویش لەگەڵ من بەئاگابوو.
بڕیارێکی زۆر قورس بوو، لە دڵی خۆمدا دەموت ( ئەو گوناهی چییە بە ئاگری من بسووتێت و ڕەنجی خوێندنی چەند ساڵەی بەهۆی منەوە بەفیڕۆ بچێت).
بۆیە کە بەیانی بۆوە، بە هاوسەرەکەمم وت: من بڕیاری خۆم دا؟
وتی: چ بڕیارێکت داوە؟
وتم: منیش لەگەڵ ئێوە دەگەڕێمەوە، هیچی تر بەرگەی تەنیایی و دووری ناگرم.

وتـی: دیـارە لەبیـرت چۆتـەوە کـە بۆچـی ئێمـەت بەجێهێشـت و دەربـەدەری نـاو ئـەم چیـاو چۆلانـە بوویـت؟!

وتـم: دەزانـم تـۆ دەتـەوێ پێـم بڵێیـت ئەگـەر بگەڕێمـەوە هەولێـر، جارێکـی تـر تووشـی دڵەڕاوکـێ دەبمـەوە لـە ترسـی ئەمـن و پیاوانـی حکومـەت.

کـە وام وت، پێـی وتـم: باشـە خـۆت وتـت، کەواتـە بۆچـی بڕیارێکـی لـەو شـێوەیە دەدەیـت؟

منیـش وتـم: نامـەوێ بـەردەوام هیچـی تـر لـەم بارودۆخـە بژیـم، دەمـەوێ لەگەڵتـان بگەڕێمـەوەو خـۆم ڕادەسـتی حکومـەت بکەمـەوەو بگەڕێمـەوە سـەربازی.

وتـی: مـن هیـچ شـتێکت پـێ ناڵێـم، ئـەوە پەیوەنـدی بـە مـان و نەمانـی خۆتـەوە هەیـە، تەنهـا دەڵێـم جارێکـی تریـش بیـری لێبکـەوە ئینجـا بڕیاربـدە نـەوەک ئەنجامەکـەی خـراپ بێـت و دواتـر لێـی پەشـیمان بیتـەوە.

منیـش وتـم: بەدرێژایـی ئـەم شـەوە بیـرم لێـی کردۆتـەوە و بڕیـاری خـۆم داوەو لێـی پەشـیمان نابمـەوە. مـرۆڤ تەنیـا جارێـک دەمرێـت، ئـەم شـەڕە نەگریسـە زۆری خایانـدو هیـچ ئومێدێکیـش نییـە کـە لـەم زووانـە ڕابوەسـتێت. ژیانـی منیـش لـە ژیانـی هاوڕێکانـم زیاتـر نییـە، دەگەڕێمـەوە سـەربازی، خـۆم دەدەمـە دەسـت چارەنـووس، بزانـم بـۆ کوێـم دەبـات.

# گەڕانەوە بۆ بەرەکانی جەنگ

ماڵئاواییم لە پلکم کرد، پێموت: بڕیارم داوە لەگەڵ هاوسەرەکەم بگەڕێمەوە هەولێر و لەوێشەوە خۆم ڕادەستی حکومەت بکەمەوە و بگەڕێمەوە سەربازی.

کە ئەمەم وت: پلکم عائیشە و لەیلای کچی زۆر پێیان ناخۆش بوو، لێم پاڕانەوە کە بەجێیان نەهێڵم و لە بڕیارەکەم پاشگەز بمەوە.

لەیلای کچە پلکم خۆی پێنەگیرا، دەستی بە گریان کرد، پلکیشم کە ئەمەی بینی ڕووی تێکردم و پێی وتم: چۆن دڵت دێت بەجێمان بهێڵیت، ئێمە لەگەڵت ڕاهاتووین و سەبووریمان پێت دێتەوە. هەر هیچ نەبێ لەبەر خاتری لەیلا لێرە بمێنەوە، ئەو تۆی زۆر خۆش دەوێی، نابینی چۆن بۆت دەگریەت.

منیش وتم: منیش ئێوەم خۆشدەوێ، تەنانەت دارو بەردو ئاو و هەواو ئاژەڵەکانی ئێرەم خۆشدەوێت، بەڵام ناتوانم چیتر ژن و منداڵەکەم بەتەنیا جێبێڵم.

کچە پلکەکەم کە زانی هەر دەگەڕێمەوە، لە گیرفانی کەوایەکەی پارچە قوماشێکی سەوزی دەرهێنا و دایە دەستم وتی: ئەم پارچە قوماشە وەکو بازن لێبکەو بیکە دەستت، بۆ پاراستنی خۆم لە دڕندەکانی ئەم شاخە، لەسەر گۆڕی سۆفی خدری دۆرە تێسوو هێناومە، تاکو ئێستا منی پاراستووە، ئەگەر ئەمەت لەدەست بێت، لەبەر خاتری سۆفی خدر، خوا لە ئاگری ئەو شەڕە نەگریسە دەتپارێزێت.

هەرچەند من باوەڕم بەو شتانە نەبوو، بەڵام لەبەر دڵی ئەو لێم وەرگرت و خستمە ناو گیرفانم و پێموت: تۆش ئەگەر

منــت خۆشــدەوێ، فرمێســکی چاوەکانــت بســڕەوە و خەفــەت مەخـۆ، بەڵێنـت پێـدەدەم ئەگـەر لـە سـەربازی تەسـریح بـووم، سـەردانتان بکـەم و دیارییێکـی جوانیشـت بـۆ بێنـم.

بـەم شـێوەیە، گونـدم بەجێهێشـت و لەگـەڵ هاوسـەرەکەم گەڕامـەوە شـاری هەولێـر. هـەر ئـەو ڕۆژە چـاوم بـە زیـاد مەنـدۆ کـەوت پێمـوت: دەمـەوێ خـۆم ڕادەست بکەمـەوە و بگەڕێمـەوە سـەربازی، ئەگـەر بزانیـت حکومـەت چـی لـەو کەسـانە دەکات کـە وەکـو مـن ماوەیـەک ڕایانکـردووەو دواییـش خۆیـان بەدەسـتەوە دەدەن؟

وتــی: لــەو ڕۆژانــە دراوســێیەکمان وەکــو تــۆ لــە ســەربازی ڕایکردبـوو، خـۆی دایـە دەسـت ڕێکخـراوی حیزبـی بەعـس و گەڕایــەوە وەحدەکــەی خــۆی لــە بەرەکانــی جەنــگ.

منیش وتم: ئەو کەسە ئێستا هیچ هەواڵی هەیە؟

وتـی: لـەو ڕۆژانـە باوکیـم بینـی، وتـی (پەیوەنـدی پێمانکـردووە، دەڵـێ سـزایان نـەداوم، لەگـەڵ سـەربازەکانی تـر دەوام دەکەیـن).

لەبەرئــەوەی پێشــتر حکومــەت ســزای لەســێدارەدانی بــۆ ئــەو کەســانە دەرکردبـوو کـە لـە سـەربازی ڕادەکـەن، بۆیـە ئاسـان نەبـوو، بەبـێ ئـەوەی دڵنیابـم خـۆم ڕادەسـت بکەمـەوە.

ئەوەبـوو هـەر ئـەو ڕۆژە چوومـە بـارەگای حیزبـی بەعـس و داوای چاوپێکەوتنـی ئەمیـن سـڕی لقـی هەولێـری حیزبـی بەعسـمکرد.

بەرپرسـی پرسـگەکە لێـی پرسـیم وتـی: بۆچـی دەتـەوێ ببینیـی؟

وتـم: برایەکـم لـە سـەربازی ڕایکـردووە و دەمـەوێ لـە ڕێگـەی ئێـوەوە ڕادەسـتی بکەمـەوە.

کـە ئەمـەم وت، زۆر ستایشـی کـردم، وتـی ئێـوەی کـورد هەرچەنـد ڕقتـان لـە یاسـا و نیـزام دەبێتـەوە، بـەڵام کاتێـک نیشـتمان هەڕەشـەی لەسـەر دەبێـت، ناتوانـن تەماشـاکەربن، بۆیـە لـە کۆتاییـدا بەرگـری لێدەکـەن.

هەرچەند لە ناخەوە گاڵتەم بە قسەکانی دەهات، چونکە من هیچ کاتێک عێراقم بە نیشتمانی خۆم نەزانیوە، تا بەرگری لێبکەم، بەڵام خۆ نەشدەکرا ڕاستییەکەی پێ بڵێم.

دوای ئەوەی تەلەفۆنی بۆ ئەمین سڕی فەرع کرد، منی نارده ژوورەوە بۆلای. ئافرەتێکی مۆدەی لەلابوو قاچی لەسەر قاچ دانابوو. سڵاوم لێی کرد، سڵاوی لێ وەرگرتمەوە و لە کورسیەکەی بەرامبەر خۆی دایینیشاندم و وتی: بۆچی دەتویست من ببینی؟

وتم: ماوەیەکە برایەکم لە سەربازی ڕایکردووە، بیستوومە حکومەت لێبووردنێکی نهێنی لە ڕێگەی ڕێکخراوەکانی حیزبی بەعس ڕاگەیاندووە. هاتووم لێی دڵنیا ببمەوە، تاکو براکەم ڕادەستی ئێوە بکەمەوە.

کە ئەمەم وت، ستایشی کردم وتی: سوپاست دەکەم بۆ ئەم هەڵوێستە جوامێرانەیەت، ئەمڕۆ نیشتمان لە هەموو کاتێک زیاتر پێویستی بە ئێوەیە.

هەر ئەوکات بانگی سکرتێرەکەی کردو پێی وت: فەرمانی لێبووردنەکە بێنە، با ئەم پیاوە بیبینێت، تاکو دڵنیابێت لە دەرچوونی.

تا ئەو فەرمانەکەی بۆهێنام، ئەو ئافرەتەی لەلای دانیشتبوو، ڕووی تێکردم وتی: بڕیارێکی دروستت داوە، منیش دوێنێ ئەم کاتانە باوکی منداڵەکانم ڕادەست کردەوە، ئێستا ئێمەش ئاسوودە بووین. پێشتر لەگەڵ تەقەی دەرگا دڵمان ڕادەچەنی و دەترساین نەوەک خەبەریان لێدابین و بیگرن.

ئەو ئافرەتە لەچاوەکانی دیاربوو کەسێکی سووک بوو، تەنوورەیەکی کورتی لەبەر کردبوو، قاچی لەسەر قاچ دانابوو، جلەکەی هێندە کورت بوو، لباسی داخیلی لە ژێرەوە دیاربوو.

ڕانەکانیشی دەتوت پەنیری کوردییە، هێندە خڕوپڕ بوون.
لە دڵی خۆمدا وتم (بۆ ئاسوودە نەبێت، بەرامبەر ئەم زڕتەبۆزە قاچ لەسەر قاچ دانیشتووە، ئەگەر هاوسەرەکەی لە ماڵەوە بوایە چۆن دەیتوانی بەم شەوە لێرە بێت).
بەهەرحاڵ، سکرتێرەکەی فەرمانی لێبووردنەکەی بۆ هێنام و پیشانیدام، وتی ئێستا دڵنیا بویت؟
وتم: بەڵێ دڵنیا بوومەوە.

ئەمەم وت و چوومە دەرەوە، بە تەکسییەک گەڕامەوە ماڵەوە. کە هاوسەرەکەم چاوی پێم کەوت، وتی: ئەگەر بۆئەوە هاتوویتەوە هەموو ڕۆژێک جرت و فرت بکەیت و بچیتە ناو برادەرەکانت، بەجێمان بێڵەو بگەڕێوە گوند زۆر باشترە.
وتم: خەفەت مەخۆ، دەگەڕێمەوە سەربازی. بۆ ئەم مەبەستە ئەمڕۆ چوومە بارەگای حیزبی بەعس بۆ دڵنیابوونەوە لە دەنگۆی لێبووردنی نهێنی، کە حکومەت لە ڕێگەی بارەگا حیزبیەکانیەوە ڕایگەیاندووە.

هاوسەرەکەم وتی: کەواتە بەڕاستی دەتەوێ بگەڕێیتەوە سەربازی؟
وتم: بێزار بووم لەوەی کە ببمە ئەرک بەسەر خزم و کەسان و ئاوارەی ئەو چیا و چۆڵانەبم. لە پێناوی ئێوە لەسەربازی ڕامکردووە، کە نەتوانم بە ئارامی لەگەڵتان بم، باشترە بگەڕێمەوە.

وتی: ئەوە پەیوەندی بە ژیانی خۆتەوە هەیە، بۆیە من هیچ قسەیەکی لێناکەم. تەنها ئەوەندە دەڵێم باشترە زیاتر بیری لێبکەیتەوە، نەوەک دوایی پەشیمان ببیتەوە.
وتم: باش بیرم لێی کردۆتەوە، لەوە زیاتر هیچ ڕێگایەکی ترم لەبەردەم نییە.

# ئێمەیان بردە گرتووخانەی حارسییە

وەکـو وتـم پـاش ئـەوەی گەیشـتینە شـاری کەرکـوک، شـەوێک ئێمەیـان لـە گرتووخانەکـەی ئینزباتخانـە هێشـتەوە. بـۆ بەیانـی جارێکـی تـر بـە یـاوەری دوو ئینزبـات بـە کۆسـتەرێک ئێمەیـان بـردە شـاری بەغـداد و لەوێـش ئێمەیـان ڕادەسـتی گرتووخانـەی حارسـییە کـرد.

ئـەو گرتووخانەیـە زۆر گـەورە بـوو، چەنـد هۆڵێکـی بـۆ زیندانیکردنـی سـەربازان تیابـوو، ئێمەیـان بەسـەر ئـەو ژوورانـەدا دابەشـکرد. کـە منیـان خسـتە ژوورەوە، هـەر لەنـاو دەرگاکـەوە بـە بـەر شـەق و پێلەقـە درام تـا ژوورەوە. هێنـدەی زیندانـی تیابـوو، شـوێنی ڕاوەسـتانم نەبـوو، بۆیـە وەکـو حاجـی لەقلـەق لەسـەر یـەک قـاچ ڕاوەسـتام. هـەر کاتێکیـش کـە مانـدوو دەبـووم، کـە قاچـم دادەنـا، سـەربازە گیراوەکانـی تەنیشـتم بـە هەمـوو هێزیـان پێلەقەیـان لێـدەدام، ناچـار دەبـووم دیسـان قاچـم بـەرز بکەمـەوە. نـاوە نـاوەش نـاوی یەکێکیـان دەخوێنـدەوەو دەیانبـردە دەرەوە. ئـەو گیراوانـەی لـەژوورەوە بـوون، دەیانـوت: ئەویشـیان بۆخـواردن بـرد، سـەیرکەن چـۆن تێـری دەکـەن ئینجـا دەیهێننـەوە.

منیـش لـە دڵـی خۆمـدا وتـم (دیـارە پـۆل پـۆل بـۆ نانخـواردن دەمانبـەن، بۆیـە ئەوانـە وادەڵێـن).

بـەڵام بۆچوونەکـەم وا دەرنەچـوو، دوای تۆزێـک ئـەو کەسانەیان بـە نیـوە مردوویـی هێنانـەوە. هێندەیـان ئەشـکەنجە دابـوون، دەتـوت تەشـریح کـراون، خوێـن لـە هەمـوو جەسـتەیان فرکـەی دەکـرد.

یەکێـک لـەو گیراوانـە، گەنجێکـی زۆر جـوان بـوو، دەرچـووی کۆلێـژی کارگێـڕی و ئابـووری بـوو، کـە بردیانـە دەرەوە قاتێکـی

ڕانەکانیشی دەتوت پەنیری کوردییە، هێندە خڕوپڕ بوون.
لە دڵی خۆمدا وتم (بۆ ئاسوودە نەبێت، بەرامبەر ئەم زڕتەبۆزە قاچ لەسەر قاچ دانیشتووە، ئەگەر هاوسەرەکەی لە ماڵەوە بوایە چۆن دەیتوانی بەم شەوە لێرە بێت).
بەهەرحاڵ، سکرتێرەکەی فەرمانی لێبووردنەکەی بۆ هێنام و پیشانیدام، وتی ئێستا دڵنیا بویت؟
وتم: بەڵێ دڵنیا بوومەوە.
ئەمەم وت و چوومە دەرەوە، بە تەکسییێک گەڕامەوە ماڵەوە. کە هاوسەرەکەم چاوی پێم کەوت، وتی: ئەگەر بۆئەوە هاتوویتەوە هەموو ڕۆژێک جرت و فرت بکەیت و بچیتە ناو برادەرەکانت، بەجێمان بێڵەو بگەڕێوە گوند زۆر باشترە.
وتم: خەفەت مەخۆ، دەگەڕێمەوە سەربازی. بۆ ئەم مەبەستە ئەمڕۆ چوومە بارەگای حیزبی بەعس بۆ دڵنیابوونەوە لە دەنگۆی لێبووردنی نهێنی، کە حکومەت لە ڕێگەی بارەگا حیزبیەکانیەوە ڕایگەیاندووە.
هاوسەرەکەم وتی: کەواتە بەڕاستی دەتەوێ بگەڕێیتەوە سەربازی؟
وتم: بێزار بووم لەوەی کە ببمە ئەرک بەسەر خزم و کەسان و ئاوارەی ئەو چیا و چۆڵانەبم. لە پێناوی ئێوە لەسەربازی ڕامکردووە، کە نەتوانم بە ئارامی لەگەڵتان بم، باشترە بگەڕێمەوە.
وتی: ئەوە پەیوەندی بە ژیانی خۆتەوە هەیە، بۆیە من هیچ قسەیەکی لێناکەم. تەنها ئەوەندە دەڵێم باشترە زیاتر بیری لێبکەیتەوە، نەوەک دوایی پەشیمان ببیتەوە.
وتم: باش بیرم لێی کردۆتەوە، لەوە زیاتر هیچ ڕێگایەکی ترم لەبەردەم نییە.

# ئێمەیان بردە گرتووخانەی حارسییە

وەکو وتم پاش ئەوەی گەیشتینە شاری کەرکوک، شەوێک ئێمەیان لە گرتووخانەکەی ئینزباتخانە هێشتەوە. بۆ بەیانی جارێکی تر بە یاوەری دوو ئینزبات بە کۆستەرێک ئێمەیان بردە شاری بەغداد و لەوێش ئێمەیان ڕادەستی گرتووخانەی حارسییە کرد.

ئەو گرتووخانەیە زۆر گەورە بوو، چەند هۆڵێکی بۆ زیندانیکردنی سەربازان تیابوو، ئێمەیان بەسەر ئەو ژوورانەدا دابەشکرد. کە منیان خستە ژوورەوە، هەر لەناو دەرگاکەوە بە بەر شەق و پێلەقە درام تا ژوورەوە. هێندەی زیندانی تیابوو، شوێنی ڕاوەستانم نەبوو، بۆیە وەکو حاجی لەقلەق لەسەر یەک قاچ ڕاوەستام. هەر کاتێکیش کە ماندوو دەبووم، کە قاچم دادەنا، سەربازە گیراوەکانی تەنیشتم بە هەموو هێزیان پێلەقەیان لێدەدام، ناچار دەبووم دیسان قاچم بەرز بکەمەوە.

ناوە ناوەش ناوی یەکێکیان دەخوێندەوەو دەیانبردە دەرەوە. ئەو گیراوانەی لەژوورەوە بوون، دەیانوت: ئەویشیان بۆخواردن برد، سەیرکەن چۆن تێری دەکەن ئینجا دەیهێننەوە.

منیش لە دڵی خۆمدا وتم (دیارە پۆل پۆل بۆ نانخواردن دەمانبەن، بۆیە ئەوانە وادەڵێن).

بەڵام بۆچوونەکەم وا دەرنەچوو، دوای تۆزێک ئەو کەسانەیان بە نیوە مردوویی هێنانەوە. هێندەیان ئەشکەنجە دابوون، دەتوت تەشریح کراون، خوێن لە هەموو جەستەیان فرکەی دەکرد.

یەکێک لەو گیراوانە، گەنجێکی زۆر جوان بوو، دەرچووی کۆلێژی کارگێڕی و ئابووری بوو، کە بردیانە دەرەوە قاتێکی

پۆشـــتەی لەبەردابـــوو، بـــەڵام بـــە دشداشـــەیەکی دڕاوی خوێنـــاوی هێنایانـــەوە، دەتـــوت لـــە قەســـابخانە گەڕاوەتـــەوە، هیـــچ شـــوێنێکی بـــە ســـاغی نەمابـــۆوە. پشـــتیان بـــە مـــووس شـــەق شـــەق کردبـــوو، خـــوێ و لیمۆندۆزیشـــیان بـــۆی تێکردبـــوو. خوێنێکـــی زۆری لەبـــەر دەڕۆیشـــت، لەبـــەر ئـــازاری لەشـــی ناڵـــەی دەهـــات.
بـە گیراوێکـی نزیـک خۆمـم وت: ئـەم گەنجـە گوناهـی چییـە وایـان لێکـردووە، تـۆ بڵێـی واش لـە ئێمـە بکـەن؟
وتـــی: ئـــەو ســـەربازە شـــیعیی مەزهەبـــە، لـــە بەرەکانـــی جەنـــگ ڕایکـردووە، پـاش ئـەوەی ئینزیباتـەکان لـە ناوچـەی هـۆڕەکان لـە ناسـریە گرتوویانـە، لـە ڕێـگا جارێکـی تـر هەوڵیـداوە ڕابکاتـەوە، بۆیـــە بـــەو شـــێوەیە ئەشـــکەنجەی دەدەن.
تاکـو کاتژمێـر حـەوت و نیـوی شـەو لـەوێ مامـەوە، زۆر برسـی و تینـوو بـووم، تەنانـەت پارچـە سـەموونێکی وشکیشـیان نەداینـێ بیخۆیـن. لـە تینوویتیانیـش قوڕگـم وشـک ببـوو. داوای گلاسـێک ئـاوم لـە پاسـەوانی بـەر دەرگاکـە کـرد، ئیشـارەتی بـۆ هەندێـک شووشـەی ئـاوە تەماتـە کـرد، کـە بـۆ میزتێکـردن، لەسـەر لێـوی پەنجەرەکـە دانرابـوون، وتـی: شووشـەیەکم لەوانـە بـدەرێ هەتـا هەندێـک ئـاوت بـۆ تێکـەم. منیـش وتـم: ئـەو شووشـانە خاوێـن نیـن، میزیـان تێدایـە؟
وتـی: زوو بـۆم بێنـە، تاکـو پەشـیمان نەبوومەتـەوە، دەنـا دەبـێ لەجیاتـی ئـاو ئـەو میـزە بخۆیتـەوە.

# بەشەمەندەفەر بەرەو شاری بەسرە بەڕێکەوتین

کە شەو داهات، بە زیلێکی سەربازی ئێمەیان بردە وێستگەی شەمەندەفەر. لە گەشتی کاتژمێر هەشت، فارغۆنێکیان بۆ ئێمە گرت و بەو شەوە ئێمەیان بە شەمەندەفەر بردە شاری بەسرە.

ڕێگای نێوان شاری بەغدادو شاری بەسرە زۆر دوور بوو. دوای دوانزە کاتژمێر، ئینجا گەیشتینەجێ. بە درێژایی ڕێگا بیرم هەر لەلای ماڵی پلکم بوو، یادی ئەو ڕۆژە خۆشانەم دەکردەوە کە لەوێ لەگەڵ خەڵکی گوندی مالمن بەسەرم برد. بیرم لای ئەو ڕۆژەبوو کە بەتەنیا لە لێواری زێیەکە دانیشتبووم، ڕادیۆییێکی بچووکم لەناو دەستم دانابوو، گوێم لە هەواڵەکانی شەڕی عێراق و ئێران دەگرت، بەهیوای ئەوەی گوێم لە هەواڵێکی خۆشی شەڕ ڕاوەستان بێت، تاکو منیش تەسریح ببم و بگەڕێمەوە لای خانەوادەکەم. هەر لەو کاتەدا پیاوێکی قەڵەوی چوارشانە، لە دووری منەوە خۆی ڕووتکردەوە، هەندێک مەلەوانی کرد، دوایی لە ئاوەکە هاتە دەرەوەو بە مووسێک سەری خۆی وەکو کودی لووسکرد، دواییش هەر بەو مووووسەش مووەکانی بن هەنگڵ و ناوگەڵی خۆی خاوێنکردەوە. ئینجا جارێکی تر خۆی خستەوە ناو ئاوەکەو هەندێک مەلەوانی کرد، دوایی هاتە دەرەوەو جل وبەرگەکانی لەبەرکرد و بۆ لای گوند هەڵکشا.

یەکەم جار بوو ئەو پیاوە ببینم، بۆیە نەمدەناسی. کاتێک بۆ نانی نیوەڕۆ گەڕاوە گوند، پلکم پێی وتم (بۆیە هیچم بۆت ئامادەنەکردووە، چونکە مام سۆفی لە گەشتەکەی گەڕاوەتەوە، تۆی بۆ نانی نیوەڕۆ بانگێشت کردووە. ماڵی

مـــام سـۆفی دراوسـێی ماڵــی پلکــم بــوو، کــه چوومــه ماڵیــان، پیاوەکانــی خەڵکــی گوندیــش لــەوێ بــوون. ســڵاوم لێیانکــرد و لەسـەر خوانەکە دانیشـتم. خواردنێکی خۆش و بەلەزەتیـان ئامـادە کردبــوو. نانێکــی بەتێریــم خــوارد، دوایــی دەســتم کێشــایەوەو لــە ســووچێکی ژوورەکــە بــە چوارمەشــقی لێــی دانیشــتم. مــام سـۆفی ڕووی تێکـردم و پێـی وتـم (دەڵێـن تـۆ لەترسـی سـەدام حوسـێن ڕاتکـردووە، پێـم ناڵێـی ئـەو سـەدامە کێیـەو چـی لێتـان دەوێ؟). منیــش وتــم (ئــەو ســەرۆکی وڵاتــە، هێرشــی کردۆتــە ســەر ئێــران و دەیــەوێ شــەڕی بــۆ بکەیــن، ئــەوەی بۆشــی نــەکات، بەتونــدی ســزای دەدات). کــە ئەمــەم وت، مــام ســۆفی ســەری خــۆی لەقانــد وتــی (مەلیــک فەیســەڵ پیاوێکــی بــاش بـوو، ئەگـەر ئەویـان نەکوشـتبا، ئێسـتا ئـەو سـەدامە نەیدەتوانـی خـۆی بکاتـە گـەورەو کوێخـاو ئازارتـان بـدات). منیـش وتـم (چـی بکەیـن، ئـەوە چارەنووسـی ئێمەیـە). وتـی (ئـەدی ئـەو پیـاوەی پێـش ئـەو چـی بەسـەرهات؟). منیـش وتـم (مەبەسـتت ئەحمـەد حەسـەن بەکـرە؟). وتـی (ئـەوەی لـەدوای مەلیـک فەیسـەڵ هاتـە سـەرحوکم). کـە ئەمـەی وت، پێکەنینـم هـات، وتـم (مـام سـۆفی لەوەتــی مەلیکیــان کوشــتووە، چەندیــن کــەس هاتوونەتــە ســەر حوکـم، دواجـار ئەحمـەد حەسـەن بەکـر بـووە سـەرۆک کۆمـارو هەتـا سـاڵی ١٩٧٩ حوکمـی عێراقـی کـرد. دوایـی سـەدام حوسـێن کودەتــای لەســەر کــردو بــەزۆری داینیشــاندو جێــگای گرتــەوە. ئێسـتا ئـەو حوکمـی عێـراق دەکات). کـە ئەمـەم وت، مـام سـۆفی سـەری خـۆی لەقانـد وتـی (یەکـەم جـارە گوێـم لـەو نـاوە بێـت، بۆچـی هێرشـی کردۆتـە سـەر ئێـران و چـی لێیـان دەوێ؟). وتـم (ئەمـە چیرۆکێکـی درێـژە، پێـش ئـەوەی ئیمـام خومێنـی شـۆڕش بـکات و بگەڕێتـەوە ئێـران، لـە شـاری نەجـەف نیشـتەجێ بـوو،

بەڵام سەدام حوسێن لە چواری تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧٨ بەزۆر ئەوی دەرکرد. ئەویش چووە فەرەنسا و لە شاری پاریس نیشتەجێ بوو. دوایی بە پشتگیری وڵاتانی رۆژئاوا پەیامەکانی لە دژی شای ئێران بڵاو دەکردنەوەو لەساڵی ١٩٧٩ شۆرشی لە ئێران هەڵگیرساندو کۆتایی بە فەرمانرەوایەتی پاشایەتی محەمەد رەزا پەهلەوی هێنا، بە فرۆکەیەکی تایبەتی لە شاری تاران لەناو ئاپۆرەی جەماوەری راپەریو نیشتەوەو کۆماری ئیسلامی راگەیاندو گەرایەوە شوێنی لەدایکبوونی خۆی لە شاری قوم و لەوێ بەیەکجاری نیشتەجێ بوو. جا لەترسی تۆڵەسەندنەوە، سەدام حوسێن دەستی خۆی پێش خست و پێش ئەوەی ئیمام خومێنی خۆی قایم بکات، بیانووی پێگرت، لەرێکەوتی ١٩٨٠/٩/٢٢ رێککەوتنامەی جەزائیری هەڵوەشاندەوە، بەناوی بەرگریکردن لە خاکی عێراق پەلاماری دا و ماڵی ئەو خەڵکەشی وێرانکرد. مام سۆفی سەری خۆی لەقاند وتی (پەکوو ئەو هەموو شتە روویداوە کەچی من ئاگاداری هیچیان نیم!). منیش وتم (بۆچی تۆ لەکوێ بوویت؟) وتی (هەر لێرە بووم، بەڵام ئەوە چەند ساڵێکە بە قاچاغی چەک و فیشەکەوە خەریکم، رۆژێک لێرەم و چەند مانگێک لێرە نیم. بۆ کرینی چەک دەچمە ناو خاکی تورکیا و دواییش دەیانهێنمەوە ئێرەو بە برێک قازانج دەیانفرۆشمەوە).

***

تا دەهات رێگای بەسرە لەپێش چاوی من درێژ دەبۆوە، بە درێژایی رێگا، خەو نەچووە چاوەکانم. لەلایەک بیری ئەو ساتە خۆشانەم دەکردەوە کە لە گوند بووم، لەلایەکی تریش خەفەتم لە حاڵی خۆم دەخوارد، نەمدەزانی چارەنووسم چی دەبێت.

کاتژمێـر هەشـتی بەیانـی شـەمەندەفەرەکە گەیشـتە دوا وێسـتگەی خـۆی لـە شـاری بەسـرە. یەکـەم جـار بـوو شـاری بەسـرە ببینـم. شـارێکی گـەورەو بـڵاو بـوو، کەوتبـووە سـەر لێـواری شـەتولعەرەب. ئێمەیـان لـە شـەمەندەفەرەکە هێنـا خـوارەوە، ئـەو ئینزباتـەی لەگەڵـم بـوو، منـی خسـتە پێش خـۆی و بردمـی بـۆ ئینزباتخانـەی وێسـتگەکە. نووسـراوێکی لـە گیرفـان دەرهێنـا و دایـە دەسـت بەرپرسـی ئینزباتخانەکـە وتـی: ئـەم سـەربازە لـە وەحدەکـەی رایکـردووەو ئێسـتاش خـۆی رادەسـتکردۆتەوە. وەحدەکـەی لـە ئەهـوازە، وەریبگـرن و بـۆم واژۆ بکـەن.

بەرپرسـی ژووری ئینزباتخانەکـەش شـتێکی بـۆ نووسـی و دایـەوە دەسـتی. دوای ئـەوە ئینزباتێکـی تـری بانـگ کـردو پێـی وت: هـەر ئێسـتا ئـەم سـەربازە راکـردووە ببـە بـۆ گرتووخانـەی سـەرەکی. ئەویـش منـی بەپێـش خـۆی دا و هـەر لـە نزیـک وێسـتگەی شـەمەندەفەرەکە، منـی بـرد بـۆ بـارەگای ئینزباتخانـەی سـەربازی بەسـرە.

دوای ئـەوەی منـی رادەسـتی بەرپرسـی ئینزباتخانەکـە کـرد، ئەویش لەنـاو بینایـەی ئینزباتخانەکـە منـی خسـتە ژوورێـک، لەمـن بـەولاوە کەسـی تیـا نەبـوو، لـە خەفەتـان دەسـتم بـە گریـان کـرد، لـە رادەسـتبوونەوەم زۆر پەشـیمان بوومـەوە. لەبیـری خۆمـدا وتـم (بەرپرسـی بـارەگای حیزبـی بەعـس بەنـاوی لێبووردنـی نهێنییـەوە فێڵـی لێکـردووم و فریـوی داوم، تەپکەیـان بـۆ داناومەتـەوە و وەکـو چۆلەکـە منیـان بـە ئاسـانی گـرت).

نزیکـەی کاتژمێرێـک تێپـەڕی، هیـچ کەسـێک لێـی نەپرسـیمەوە، بانگـی پاسـەوانەکەی بـەردەرگام کـرد پێمـوت: راسـتە مـن لـە سـەربازی رامکـردووە، بـەڵام لـە شـاری هەولێـر خـۆم رادەسـتی بـارەگای حیزبـی بەعـس کـرد و بەرپرسـی بارەگایەکـە پێـی وتـم

(حکومەت لێبووردنی نهێنی بۆ ڕاکردووەکانی سوپا دەرکردووەو سزاتان نادەن. کەچی لەوەتی خۆم ڕادەست کردۆتەوە وەکو تاوانبارێک مامەڵەم لەگەڵ دەکەن؟).

پاسەوانەکە لێم هاتە پێشەوەو پێی وتم: لە سەربازی ڕاتکردووەو هێشتان گلەییش دەکەیت، خۆ ناشتەوێ بە تەپڵ و مۆسیقا پێشوازیت لێبکەین؟!

منیش وتم: مەبەستم ئەوە نییە، تەنیا دەمەوێ بزانم چارەنووسم چی دەبێت، ئایا بەرلێبووردنی گشتی دەکەوم یان نا؟

وتی: پەلە مەکە، تۆزێکی تر جەماعەتی ئیعاشەی وەحدەکەتان دێنە ئێرە، لەگەڵ ئەوان دەتنێرینەوە بەرەکانی جەنگ، ئیتر لەوێ خۆت و بەختت، یان جارێکی تر خانەوادەکەت دەبینیتەوە، یانیش وەکو هاوڕێکانی پێش خۆت، شەرەفی شەهادەت بەردەکەوێ و دەچیتە ڕیزی نەمران.

بەم شێوەیە، هێندەی پێنەچوو، منیان لە گرتووخانەکە دەرهێنا و ڕادەستی جەماعەتی ئیعاشەی وەحدەکەی خۆمیان کردەوەو لەگەڵ ئەوان گەڕامەوە وەحدەکەمان لە ناوچەی ئەهواز لەناو خاکی ئێران لە دووری دە کیلۆمەتر لە شاری موحەمەرە.

کە گەیشتینەجێ، تاهیری هاوڕێم لە دوورەوە کە منی بینی، بە ڕاکردن هاتە لام، باوەشی پێداکردم و ماچی کردم. دوای ئەویش عوسمان و دڵشادو فاخیرو سەید محەمەد و ئەبو وەندیش هاتن، بەخێرهاتنێکی گەرمیان لێکردم.

تاهیر پێی وتم: لەکاتێکی زۆر خراپ هاتوویتەوە، دوو مانگە ئیجازە و دابەزینیان ڕاگرتووە، لە حاڵەتی ئامادەباشیی تەواو داین، ئەگەری پەلاماردانمان لەسەرە.

منیش وتم: له ڕاکردن و خۆشاردنەوەو دەربەدەری زۆر بێزار بووم، بۆمن ئێرەو ئەوێ وەکو یەکە. لە هەردوو حاڵەتدا لە خێزانەکەم دوورم و ناتوانم لەگەڵیان بژیم، بۆیە خۆم ڕادەستکردەوەو هاتمەوە.
ئەویش وتی: زۆربەی هاوڕێکانمان دوای تۆ ڕایانکرد، تەنیا ئێمەی بێدەسەڵات لێرە ماوینەتەوە. ئەگەر کەسێکمان وەکو ئەوان لە دەرەوەی شار شک ببردبا بچینە لای، دەمێک بوو ئێمەش ڕامان دەکرد.
تەماشایەکی سەربازەکانم کرد، ئەوانەی کە پێشتر لە بنکەی مەشقکردن لەگەڵم بوون، لەوێ نەمابوون، بە تاهیرم وت: عەزیزە سۆر و عەبدولمونمین دەشتی نابینم؟ وتی: عەزیزە سۆر گواستراوەتەوە بۆ وەحدەیەکی تر، شوێنەکەی زۆر لێرە دوور نییە. ئەگەر حەز بکەیت دوای تۆزێکی تر خۆمان دەدزینەوەو دەچینە لای. سەبارەت بە عەبدولمونمین دەشتیش، دوای تۆ ئەویش ڕایکرد و ئێستا نازانم لەکوێیە؟
وتم: ئەی ئەحمەد کەشخە لە کوێیە بۆچی نایبینم؟
کە ئەمەم وت، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا وتی: تەمەنی درێژی بۆ تۆ بەجێهێشت، لەو ڕۆژانە ئێرانییەکان هێرشیان کردە سەرمان، زۆریان لێ کوشتین و چەند سەربازێکیشیان لێمان بەدیل گرت. ئەحمەد کەشخە لەو شەڕەدا شەهید بوو.
کە ئەمەی وت، زۆر خەفەتم بۆی خوارد، چونکە گەنجێکی جوان و کەشخە بوو، زۆر دڵی بە دونیا خۆشبوو، وەکو ئێمە نەبوو، لەناو سەربازگەش بایەخی بە جل وبەرگ و ڕوخساری خۆی دەدا و هەمیشە دواهەمین مۆدێلی جلوبەرگ لەبەر ئەو دەبینرا.
تاهیر کە زانی زۆر خەفەتم بۆی خوارد، وتی: خەفەت مەخۆ، ئەو ڕێگایە لەپێش هەموومانە، مەگەر خوا، دەنا کەسمان

بەسەلامەتی دەرناچین. ئەو ئێرانیانە کە هێرش دەکەن، هیچ هێزێک لەبەرامبەریان خۆی ڕاناگرێت.
منیش وتم: بۆیە خەفەتی بۆ دەخۆم، چونکە زۆر حەزی لە مۆدێلی نوێیی جل وبەرگ بوو، هەمیشە بایەخی بەخۆی دەدا.
تاهیر وتی: باسی مۆدێلی جل وبەرگت کرد، سەربردەیەکی سەیری ئەوت بۆ دەگێڕمەوە. پێش ئەوەی شەهیدبێت، لە هێرشێکی ئێرانییەکان بۆسەر وەحدەکەمان، هێزەکانیان تێک وپێک شکان و کۆمەڵێک کوژراویان لە گۆڕەپانی جەنگ لەدوای خۆیان بەجێهێشت. یەکێک لە کوژراوە ئێرانییەکان، گەنجێکی زۆر جوان و پۆشتەبوو، وەکو خوالێخۆشبوو وابوو، تیشێرتێکی زۆر جوانی دوا مۆدێلی لەبەردا بوو. ئەحمەد کەشخە کە ئەوی بینی، چووە سەر تەرمەکەی و بە مردوویی تیشێرتەکەی لەبەر داکەند و لەبەر خۆی کرد.
ئێمە لەسەر ئەو ڕەفتارەی سەرزەنشتمانکرد پێمانوت (ئابڕووچوونە جل وبەرگ لەبەر مردوو دابکەنیت، ئەبێ مردوو ڕێزی لێبگیرێت، نەک ئەم سووکایەتیەی پێبکرێت)، بەڵام ئەو هیچ تەریق نەبۆوەو زۆر بەلایەوە ئاسایی بوو، وتی (ئەم تیشێرتە مۆدێلەکەی نوێیە، جارێ نەگەیشتۆتە عێراق، ئەو تازە مردووەو سوودی لێ نابینێ، بۆ من باشە، کە گەڕامەوە هەولێر لەبەرخۆمی دەکەم و لە شەقامی باتا پیاسەی پێدەکەم، بەو تیشێرتە، سەرنجی کچە جوانەکان بۆلای خۆم ڕادەکێشم).
منیش وتم: جا دەرفەتی ئەوەی بوو پێش شەهیدبوونی بگەڕێتەوە هەولێرو ئەو خەونەی بهێنێتە دی؟
وتی: نەخێر، دوای دوو هەفتە جارێکی تر ئێرانییەکان هێرشیان کردەوە سەرمان و لەو شەڕەدا ئەحمەد کەشخە شەهید بوو.
ئێمە لەو قسانەدا بووین، عەریف فەسیلەکەمان ئەبو وەندی

پێـی وتـم: لەژێـر زەوی چەنـد حەشـارگەیەکمان بـۆ سـەربازەکانی فەسـیلەکەمان لێـداوە، هــەر یەکێـک لــەو حەشــارگانە ســێ سـەربازی تیـا دەخـەوێ، تەنهـا یەکێـک لـەو حەشـارگانە نەبێـت، یـەک سـەربازی تیـا دەخەوێـت. تـۆ یەکێـک لەوانـە هەڵبژێـرەو تیـای بخـەوە.

منیـش وتـم: دەچمـە ئـەو حەشـارگەیەی کـە تەنهـا یـەک کەسـی تیایـە، نامـەوێ شـوێنی ئەوانـی تـر سـەخڵەت بکـەم.

کـە ئەمـەم وت، تاهیـر بـە پێکەنینـەوە وتـی: عوسـمان شـارەزووری بەتەنهـا لـەو حەشـارگەیە دەخەوێـت، کەسـێکی سەرشـێتە، لەگـەڵ تـرپی خـۆی بەشــەڕدێت، بڕواناکــەم بتوانــی تەنهــا یــەک شــەو لەگەڵــی بحەوێیتــەوە.

هەرچەنـدە مـن عوسـمان شـارەزووریم نەدەناسـی، بـەڵام بـاوەڕم نەکـرد کەسـێکی بـەو ڕادەیـە خـراپ بێـت، بۆیـە وتـم: قەینـاکات منیــش خــۆم تاقــی دەکەمــەوەو دەچمــە لای ئــەو، یــان چاکــی دەکەمــەوە یانیـش منیـش وەکـو ئـەو شـێت دەبـم.

ئیتــر ئەوەبــوو ئەبــو وەنــدی منــی بــردە کــۆگای کەلوپەلــەکان، هەندێـک بەتانــی و بالیفێکــی بــۆ وەرگرتــم. دوایــی منــی بــردە لای عوسـمان و بەومـی ناسـاندو وتـی: ئێمـە ئەومـان سەرپشـک کـردووە کـە لەکـوێ بخەوێـت، بـەڵام خـۆی لای تـۆی هەڵبـژاردو پێـی خۆشـە لەگـەڵ تـۆ بخەوێـت.

عوسـمان کـە منـی بینـی، باوەشـی پێداکـردم وتـی: وادیـارە مـن ناناسـیتەوە، لـە بنکـەی مەشـقکردن لـە بەغـداد بەیەکـەوە بوویـن، بـەڵام فەسـیلەکانمان جیابـوو.

منیــش وتــم: لێــم مەگــرە، ئەگــەر پێــش ئێســتاش بەیەکــەوە قســەمان کردبێـت، لەبەرئــەوەی نزیکــەی ســاڵێکە لــە ســەربازی ڕامکــردووە، بۆیــە زۆر شــتم لەبیــر نەمــاوە.

حەشارگەیەکی زۆر گەورەبوو، شوێنی چوارکەسی تیا دەبۆوە، عوسمان شوێنی خۆی لەلایەک ڕاخستبوو، منیش لەلایەکەی تر شوێنی خۆم ڕاخست و لێی ڕاکشام.
حەشارگەکە بریتی بوو لە ژوورێکی دوو بەسێ بەرزیەکەی تەنیا دوو مەتر دەبوو، سەریان بە جەمەلۆن گرتبوو، بە خۆڵیش سەری جەمەلۆنەکانیان داپۆشیبوو. مشکێکی زۆریش لە ناوەوە جرت وفرتیان بوو، هێندە چاو نەترس بوون، بەسەرمان پازیان دەدا. ڕووم لە عوسمان کردو پێم وت: لەبەر ئەو مشکانە چۆن خەوت لێدەکەوێ، پێدەچێت مشکی ئێرە زۆر هاروهاژبن؟
سەری خۆی لەقاند وتی: هێشتان تۆ چیت بینیوە، دوای کەمێکی تر جورجەکان کە بۆنی خواردن دەکەن، لە کونەکانیان دێنە دەرەوەو بەسەر لاشەمان پازدەدەن.
منیش وتم: بۆچی نایانکوژیت؟
وتی: لەم فەسیڵە گەورەیە هیچ کەسێک هاوڕێیەتیم ناکات، هەموویان ڕقیان لێم دەبێتەوە، تەنیا ئەو مشک و جورجانە نەبێت منیان خۆشدەوێ و تاکو بەیانی لەگەڵمدان.
منیش وتم: واپێدەچێت زۆرت خۆشبوێن؟
بە زەردەخەنەیەکەوە وتی: تۆش لە شوێنی من بیت خۆشت دەوێن، ئەوان لەو تەنیاییە هاوڕێیەکی باشن بۆمن، هەرچەند لە زمانیان تێناگەم، بەڵام تاکو بەیانی قسەیان لەگەڵ دەکەم و هۆنراوەیان بۆ دەهۆنمەوە، ئەوانیش گوێم لێدەگرن و لە دەوروپشتم کۆدەبنەوە.
ئەمەی وت و لەپشت سەریەوە دەفتەرێکی دەرهێنا، کۆمەڵێک هۆنراوەی لەسەر ئەو مشکانە تیا نووسیبۆوە. هەندێکی لەو هۆنراوانە بۆ خوێندمەوە وتی: ئەم مشک و جورجانەم بۆیە خۆشدەوێن، چونکە وەکو مرۆڤەکان درۆزن و دووڕوو نین.

لەگـەڵ عوسـمان چەنـد ڕۆژێکـم لـەو حەشـارگەیە بەڕێکـرد. ئەگـەر دەم دەمانێـم لەگەڵـی بکردبـا و وەڵامیـم بدابـاوە، دەبـوو هەمـوو ڕۆژێـک شـەڕی لەگـەڵ بکـەم. بـەڵام زۆر بەزەییـم پێـی دەهاتـەوە، هـەر زوو بـۆم بەدیارکـەوت، کـە کەسـێکی نەخۆشـە، نەخۆشـی دەروونـی هەیـە. بۆیـە هەمـوو شـتێکم لێـی قبـوڵ دەکـردو ڕەچـاوی بـاری دەروونیـی ئـەوم دەکـرد. هەمـوو کات پێـم دەوت: تـۆ بـرا گەورەیـت ئەگـەر جوێنیشـم پێبدەیـت، قبوڵمـە و لێـت عـادز نابـم. ئەویـش بـە قسـەکانی مـن دڵخـۆش دەبـوو، هەمـوو جارێـک، لای سـەربازەکانی فەسـیڵەکەمان و ئامیـری فەسـیڵەکەمان دەیـوت: سـەربازەکانی ئـەم فەسـیڵە هەموویـان نـەزان و نەفامـن، تەنیـا ئەبـو شـوارب نەبێـت (وەک ئامـاژەیـەک بـۆ مـن) وەکـو مـن ڕۆشـنبیر و زانایـە.
کـە ئەمـەی دەوت، سـەربازەکانیش بەقسـەکانی پێدەکەنیـن و بـە گاڵتـەوە دەیانـوت: حاڵمـان خۆشـدەبێت، ئەگـەر ئەویـش وەکـو تـۆ بێـت! بـەڵام ئـەو کەسـێکی جیـاوازە، هـەر بۆیـە تاکـو ئێسـتا توانیویەتـی لەگـەڵ تـۆ بحەوێتـەوە.
ئـەو شـوێنەی وەحدەکـەی ئێمـەی لێبـوو، شـوێنێکی دەشـتایی پـان و بەریـن بـوو. ئێرانییـەکان بـۆ ڕێگاگرتـن لـە هێرشـەکانی سـوپای عێـراق بۆسـەر بنکـەو بارەگاکانیـان، ئاوێکـی زۆریـان بەردابـۆوە ئـەو ناوچەیـەو زۆنگاوێکـی گـەورەی لـێ دروسـت ببـوو. ئاوێکـی سـپی و سـازگاری تیابـوو، چـوار دەوریشـی قەمیشـەڵان بـوو. باڵنـدەی ماسـیگرەو مریشـکە ڕەشـە، لەنـاو ئاوەکـەدا دەخولانـەوە، دیمەنێکـی جـوان و دڵڕفێـن بـوو.
زۆرجـار لەگـەڵ یەکتـری گرەومـان لەسـەر پێکانـی ئـەو مریشـکە ڕەشـانە دەکـردو لەسـەر سـاترەکەوە بـە کلاشـینکۆف نیشـانمان لـێ دەگرتـن.

ئەوەنـدی لـەوێ بـووم بـۆ تەنهـا جارێکیـش ئامانجەکـەم نەپێـکا، بـەڵام سـەربازەکانی تـر نیشـانگری چـاک بـوون، زۆر بـە ئاسـانی ئامانجەکانیـان دەپێـکا و مریشـکە ڕەشـەکانیان دەکوشـت.
سـەربازێکمان لەگەڵدابـوو، نـاوی تەهـا بـوو، خەڵکی گوندێکـی نزیـک شـاری هەولێـر بـوو، نیشـانگرێکی بـاش بـوو. ئێوارەیـەک هەردووکمـان لەشـوێنی چاودێـری لـە سـاتری پێشـەوە ئێشـکگر بووین، پێـم وت: بیسـتوومە تـۆ نیشانشـکێنێکی باشـیت، هیـچ فیشـەکێکت بەفیـڕۆ ناچێـت. بـا مـن و تـۆ گرەوێـک بکەیـن، مریشـکە ڕەشـێک بکەینـە ئامانـج و ئەگـەر بـە یەکەمیـن فیشـەک لێـی بدەیـت، کـە حانوتـە گەڕۆکەکـە هـات، یـەک کیلـۆ پاقـلاوەت بـۆ دەکـڕم.
کـە ئەمـەم پێـی وت، زۆری پێخـۆش بـوو، نیشـانەی لـە مریشـکە ڕەشـێک گـرت و بـە ڕاوەسـتانەوە بـە کلاشـینکۆفەکەی فیشـەکێکی تێـی گـرت و لـە شـوێنی خـۆی هەڵیپەڕانـد.
منیـش چەپڵـەم بـۆی لێـدا و پێـم وت ماشـەڵات لێبێـت، نیشـانگرێکی نـاوازەی.
ئێمـە لـەم قسـانەدا بووین، موراسـیلی ئامـر بـە ڕاکـردن هاتـە لامـان و بە تەهـای وت: هـەر ئێسـتا ئامیـر تـۆی دەوێ.
تەهـا لــە ترسـان ڕەنگــی تێکچـوو، هەمــوو لەشــی وەکــو کێــچ دەلــەرزی. منیــش وتــم: بۆچــی دەترســێیت؟
وتـی: ئامیـر سـریەکەمان ڕائیـد جاسـم پیاوێکـی سەرشـێتە، وادیـارە بـە دووربینەکـەی چاودێـری ئێمـەی کـردووە، بۆیـە ناردوویەتـی بـە شـوێنمدا.
منیـش بـە موراسـیلی ئامـرم وت: تـۆ نازانیـت بۆچـی ئامیـر لـەدوای نـاردووە؟
وتـی: کـە ئێـوە تەقەتانکـرد، لەوکاتـەدا ئامیـر بـە دووربیـن تەماشـای ئێـوەی دەکـرد، بـەڵام نازانـم بۆچـی تەنهـا داوای تەهـای کـردووە.

بەهەرحاڵ، تەها لەگەڵ موراسیلی ئامیر ڕۆیشت. دوای کەمێک بە پێکەنین گەڕایەوە لام وتی: ئامیر دەستی خستە سەر شانەکانم و بە ئامیر فەسیڵی وت (تەها سەربازێکی ئازایە و نیشانشکێنێکی بە توانایە) ئەمەو لەنێوان خۆیاندا زۆریان قسەکرد، بەڵام من هیچی لێ حاڵی نەبووم.

کە ئەرکەکانمان تەواو بوو، عەریف فەسیلەکەمان ئەبو وەندی هاتە لامان و پێی وتین: تەها چەند سەربازی ئێرانی کوشتووە، ئامیر وا پێی سەرسام بووە، ناوی بۆ ئامیر لیوا بەرز کردۆتەوە تاکو نیشانەی ئازایەتی پێببەخشن.

پێکەنینم بە قسەکانی هات، ڕووم لە تەها کردو پێموت: واپێدەچێت ئامیر سریە بەهەڵەداچووبێت، وادەزانێ کە تۆ فیشەکەکەت لە سەربازێکی ئێرانی داوە و کوشتووتە نەک مریشکە ڕەشە! بۆیە ناوی تۆیان بەرز کردۆتەوە بۆ بارەگای لیوا تاکو نیشانەی ئازایەتیت پێببەخشن.

وەکو وتم ئەو شوێنەی کە ئێمەی لێبووین، سروشتێکی دڵڕفێنی هەبوو، بەڵام لەترسی نیشانەی قەناس هەڵگرە ئێرانییەکان نەماندەوێرا بچینە سەر ئاوەکە بۆ خۆ شوشتن و ئاو خواردنەوە. چونکە ئەو قەناس هەڵگرانە نیشانگرێکی زۆر بەتوانا بوون، ئەوەی سەری خۆی لە پشت سانرەکە دەربهێنابا، ئەگەر، مەبەستیانبا، بە گوللەی قەناسەکانیان دەیانپێکا.

هەرچەند هەندێک جار سەرکێشیمان دەکرد و گوێمان نەدەدایە ئەو مەترسییانەو بۆ ڕاوکردنی مریشکە ڕەشەکان دەچووینە سەر ساترەکەو نیشانمان لێیان دەگرت. چەند سەربازێکمان لە ئەنجامی ئەو سەرکێشی و بێباکییە بە گوللەی ئەو قەناسچییانە شەهید بوون.

لە نزیک وەحدەکەی ئێمە، مەزاری ژنێکی ئیمانداری شیعە

مەزهەبی لێ بوو، ناوی زومریە فاتم بوو، سەربازە شیعەکان لە کاتی دەستبەتاڵی دەچوونە سەر مەزارەکەی، خاوێنیان دەکردەوەو بوخوریشیان لەسەر گۆڕەکەی دادەگیرساند.

لەبەر پیرۆزیی زومریە فاتم، سەربازەکان دەستیان بۆ کەلوپەلی ماڵی خزمەتکاری مەزارەکەش درێژ نەکردبوو، کە ماڵیان لەناو حەوشەی مەزارەکە بوو.

زۆربەی ڕۆژەکان لەکاتی پشوودا، منیش دەچوومە سەر مەزارەکە. قورئانێک لەسەر گۆڕی زومریە فاتم دانرابوو، چەند ئایەتێکم لێی دەخوێندەوە، دواییش بەر لەوەی بەجێی بهێڵم سورەتێکی فاتیحەم بۆ گیانی پاکی دەکردە دیاری.

ڕۆژێک لەکاتی هاتنە دەرەوەمدا، لەبەر دەرگای مەزارەکە، دەبابەیەکی ئێرانی لەدوورەوە دوو گوللە تۆپی لە مەزارەکە گرت و گومبەتەکەی هێنا خوارەوە. بەسەرسوڕمان لێی ڕزگارم بوو، ئەگەر لەناو مەزارەکەبام، پارچە پارچە دەبووم.

حەفتەی جارێک ئۆتۆمبێلی ئیعاشە و تانکەری ئاو دەهاتنە بەرەکانی پێشەوەی جەنگ، ئازووقەو خواردنی قوتوو لەگەڵ ئاوی خواردنەوەیان بۆ دەهێناین. بە سێ کەسان یەک جەلیکان ئاویان دەداینێ، ئەگەر خۆمان پێی بشۆردبا، بەشی دوو ڕۆژی نەدەکردین، بۆیە تەنیا بۆ چێشتلێنان و چایە و خواردنەوە بەکارمان دەهێنا.

ڕۆژێک بەخەیاڵمدا هات، لەگەڵ عوسمان بیرێکی ئاو لێبدەین، خۆمان و سەربازەکانی تریش لەم بێ ئاوییە ڕزگاربکەین. هەروەها ئەم هەلەش بقۆزمەوە بۆ ئاشتکردنەوەی عوسمان و سەربازەکان. ڕووم لە عوسمان کردو پێموت: خۆت دەزانیت دەمێکە لەبەر بێ ئاوی خۆمان نەشۆردووە، ئەگەر پێت باش بێت، من و تۆ بەیەکەوە بیرێک لێبدەین تا دەگاتە ئاو، ئەوکاتە گشت

سەربازەکانی فەسیلەکەمان چاویان لە دەستی ئێمە دەبێت ئاویان پێبدەین.
عوسمان بیرۆکەکەی پێ باش بوو، دەمودەست لەنزیک حەشارگەکەی خۆمان دەستمانکرد بە لێدانی بیرەکە. ڕۆژانە لەکاتی پشوودا خەریکی هەڵکەندنی دەبووین.
دوای ئەوەی نزیکەی حەفتەیەک ئیشمان تیاکرد، گەیشتینە ئاو، ئینجا پارچە کندرێکمان لە سەتڵێک بەستەوەو خستمانە ناو بیرەکەو بە سەتڵەکە ئاومان لە بیرەکە دەردەهێنا. ئاوەکە تۆزێک سوێر بوو، بۆیە بۆ خواردنەوە دەستی نەدەدا، بەڵام بۆ خۆشوشتن و جلک شوشتن عەیبی نەبوو، لە بێچارەیی باشتر بوو.
کاتێک سەربازەکانی فەسیڵەکەمان بەمەیان زانی، هاتنە لامان و داوای ئاویان لێکردین بۆ خۆشوشتن و جلک شوشتن. منیش پێم وتن: ئەگەر عوسمان نەبوایە ئێستا خاوەنی ئەم بیرە ئاوە نەدەبووین.
کە ئەمەم وت، لە خۆشییان عوسمان وەخت بوو بفڕێت، بە ڕووێکی خۆش بە سەربازەکانی وت: بەساقەتان بم، ئەم ئاوە ئەگەر بۆ ئێوە نەبێت ئەی بۆ کێ دەبێت، ئەو بیرەم بۆ ئێوە لێداوە، هەرکاتێک پێویستتان بە ئاو بوو، پرس بە من مەکەن بە ئارەزووی خۆتان ئاو لە بیرەکە هەڵێنجن.
بەم شێوەیە پەیوەندیی سەربازەکان لەگەڵ عوسمان ئاسایی بۆوە، ئەویش لێیان نزیک دەبۆوەو کاتێکی خۆشمان لەگەڵ یەکتری بەسەردەبرد.
کە تاهیر ئەمەی بینی، سەری سوڕما، پێی وتم: دەزانم تۆ خاوەنی ئەم بیرۆکەیەیت، ئەگەر تۆ نەبوای قەت عوسمان ئەم کارەی نەدەکرد، بەڵام کارێکی باشتکردووە، خێرت پێ

گەیشتووە کە بەهۆی ئەم بیرەوە پەیوەندی نێوان ئێمەو عوسمانت ئاسایی کردۆتەوە.
ئامیری سریەکەمان کەسێکی سەرشێت بوو، حەفتەی جارێک پێش ڕۆژئاوابوون، بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر جموجووڵی سەربازیی سوپای ئێران، نزیکەی بیست سەربازی لە سریەکە دەهێنا دەرەوەو لەگەڵ خۆی دەیبردنە پشت ساتر و بە نێوان ئەڵغامەکانی وەحدەکەمان دەڕۆیشتن تا لە ساتری ئێرانییەکان نزیک دەبوونەوە. ئەو سەربازەی فەرمانەکەشی جێبەجێ نەکردبا، دەیگرت و بەناوی ترسنۆک فڕێی دەدایە بەندیخانەو سزای دەدا.
زۆرجار پێش ئەوەی ئەرکەکانیان جێبەجێ بکەن و بگەڕێنەوە، جموجووڵەکەیان ئاشکرا دەبوو، دەدرانە بەر ڕێژنەی تفەنگ و تۆپباران دەکران، هەندێ جاریش ڕووبەڕووی دەوریە قیتالی سەربازەکانی سوپای ئێران دەبوونەوە و چەند کەسێکیان لێ دەکوشتین و هەندێکیشیان لێ بە دیل دەگرتین.
دەرچوونی کەمین و دەوریە قیتالی لای ئەو ئامیر سریە سەرشێتەمان ببووە ئاو خواردنەوە، زۆربەی سەربازەکانی وەحدەکەمانی بەوە سەرقاڵ کردبوو.
بۆ خۆ دەربازکردن لەدەستی ئامیر، ڕۆژێک بیرۆکەیەک بەخەیاڵمدا هات، بە تاهیرم وت: ئەگەر ئەمجارە ئامیر ئێمەی کۆکردەوە بۆ دەسنیشانکردنی تیمی دەوریەی قیتالی، پێش ئەوەی ئامیر دەسنیشانمان بکات، دەستمان بەرز دەکەینەوە و دەڵێین ئێمە لەگەڵت دێین.
تاهیر لە مەبەستم نەگەیشت، بە سەرسوڕمانەوە وتی: ئێمە کێشەمان لەگەڵ ڕائید جاسم ئەوەیە کە بە زۆری بۆ دەوریە قیتالی دەمانباتن کەچی تۆ ئاسانکاری بۆ دەکەیت، دەتەوێ

بە قاچەکانی خۆمان بچینە ناو ئاگرو گیانی خۆمان بخەینە دەست ئەم ئامیرە شێتە!!
منیش وتم: بە هەڵە لێم تێمەگە، من مەبەستم ئەمە نییە. ئەم ئامیرەی ئێمە شێتەو گوێ لەکەس ناگرێت، تەنیا خۆی پێ ڕاستە. بۆیە دەبێ ئێمەش وەکو ئەو خۆمان بە شێت پیشانبدەین، تاکو لەدەستی ڕزگارمان بێت.
تاهیر وتی: هیچ لە پلانەکەت تێناگەم، دەتوانی زیاتر ڕوونی بکەیتەوە؟
وتم: ئەگەر ئەمجارە بۆ ئەم مەبەستە کۆیکردینەوە، من و تۆ بە ئارەزووی خۆمان دێینە دەرەوە و پێی دەڵێین ئێمە لەگەڵت دێین. بێگومان ئەویش زۆری پێ خۆش دەبێت و ستایشمان دەکات. پێش ئەوەی فەرمانمان پێبکات، بۆ پەڕینەوە لە کێڵگەی ئەڵغامەکان و نزیکبوونەوە لە ساتری ئێرانییەکان، تۆ سندووقێک ڕومانە هەڵبگرە و منیش سندووقی فیشەک و چەکەکەم هەڵدەگرم. ئینجا هەردووکمان لە ساتر ئاودیو دەبین و بەدەم گۆرانی وتنەوە بەرەو کێڵگەی ئەڵغامەکانی خۆمان و ساتری ئێرانیەکان دەڕۆین. هەر لەو کاتەشدا تۆ ناوە ناوە نارنجۆکێک لە سندووقەکە دەربهێنە و بە کێڵگەی ئەڵغامەکان بیانتەقێنەوە. منیش لوولەی چەکەکەم لە ئاسمان دەکەم و بە سەڵی تەقە دەکەم. جا کاتێک ئامیر ئەم دیمەنە دەبینێ، لەو ڕەفتارە شێتانەیەی ئێمە زۆر تووڕەدەبێت و خۆی لەبیر دەچێ کە شێتە، هەروا دەزانێ ئێمە شێتین بۆیە بۆ هەتا هەتایە لەو ئەرکە پڕ مەترسییە دەمانبەخشێت.
کە ئەمەم وت، تاهیر لە قاقای پێکەنینی دا، ئافەرین بۆ ئەم بیرۆکە جوانەت، دەتەوێ بڵێی دەبێ شێت بە شێت بگرین؟!
وتم: ئەوە ڕاستە، ئەو ئامیرەمان سەرشێتەو گوێ لە کەس ناگرێت، بۆیە دەبێ بە هەمان لۆژیکی خۆی مامەڵەی لەگەڵ

بکەیـن.
ڕۆژی دواتـر کاتێک ئامیـر سریە ئێمـەی بۆ ئـەم مەبەستە کۆکـردەوە، مـن و تاهیـر ئـەو پلانـەی کـە پێشـتر دامانڕشـتبوو، وەکـو خـۆی جێبەجێمـان کـرد. پێشـبینییەکەم هاتـەدی، پێـش ئـەوەی بگەینـە نـاو کێڵگـەی ئەڵغامـەکان، عەریـف فەسـیلی بەدوامانـدا ناردو ئێمـەی گەڕانـدەوە لای ئامیـر، ئامیریـش زۆر جوێنـی پیسـی پێدایـن و بـە تووڕەییـەوە وتـی: مـن وامزانـی ئێـوە پیـاوی ئاقڵـن، زۆر دڵخـۆش بـووم بـەوەی بـە ئـارەزووی خۆتـان لـە ڕیزەکـە هاتنـە دەرەوە، نەمزانـی ئێـوە شـێتن، دەتانـەوێ بـەو شـێتییەتان بەکوشـتنمان بـدەن!!
ڕووی لـە ئامیـر فەسـیڵ کـردو پێـی وت: نـاوی ئـەو دوو سـەربازە لای خـۆت تۆماربکـە، نامـەوێ جارێکـی تـر بـۆ دەوریـەی قیتالـی لەبـەردەم خـۆم بیانبینمـەوە.
بـەم شێوەیە لەدەست ئـەو ئامیـر سریە شێتە و دەوریـە قیتالییەکانـی ڕزگارمـان بـوو.
دوای ماوەیـەک جووڵەیـان بـە یەکـە سـەربازیەکەمان کـرد، ئێمەیـان بـۆ ڕۆژهەڵاتـی شـاری بەسـرە گواسـتەوە. ئـەو ڕۆژەی کـە یەکـە سـەربازیەکەمان جووڵـەی پێکـرا، زۆر نەخـۆش بـووم، پلـەی گەرمیـم زۆر بـەرز ببـۆوە، دەموچـاوم لـە گەرمییـان وەکـو خورمـا سـوور هەڵگەڕابـوو. تاهیـر کلاشـینکۆفەکەی خـۆی و چەکەکـەی منـی بەشـانیەوە کردبـوو، منیـش بـە نقەنـق بـەرەو لای زیلەکـە دەڕۆیشـتم. کاتێـک ئامیـر منـی بـەم شـێوەیە بینـی، زۆر تووڕەبـوو، دەسـتی بەجوێنـدان کـرد. بەتاهیـری وت: بۆچـی چەکەکـەی ئـەوت هەڵگرتـووە؟
ئەویـش وتـی: گـەورەم دوو ڕۆژە نەخۆشـە، تایەکـی زۆر گەرمـی لێیـە، ناتوانـێ هەڵیبگرێـت.
ئامیریـش وتـی: ئـەو ئازایـە دەڵێـی شـێرە، بیـدەوە دەسـتی، بـا خـۆی هەڵیبگرێـت.

چەکەکەی خۆم لە تاهیر وەرگرت و بەهەر شێوەیەک بێت خۆم گەیاندە ناو ئیڤایەکە. کە گەیشتینەجێ، ئەو شوێنەی کە بۆ سریەکەی ئێمە تەرخانکرابوو، بیابانێکی چۆڵ بوو، هیچ شتێکی لێ نەبوو. دوای ئەوەی کەلوپەلەکانمان لە ئیڤایەکە داگرت، ئامیر هاتە لامان و بە دار حەیزەرانەکەی چەند شوێنێکی لەسەر زەوی بۆ حەشارگەو خەوتنی شەوان و کۆگای چەک و تەقەمەنی دیارکرد.

بە ئامیر فەسیلی وت: سەربازەکانت بۆ چەند گرووپێک دابەش بکە، دەبێ تاکو ئێوارە ئەم حەشارگانە گشتی تەواوبکەن. ئەوگرووپەی تەواوی نەکات، بەتوندی سزای دەدەم. کارمەندانی مەجهوودی حەربیش بەخۆیان و شۆفەڵەکانیان لەپێش ئێمە خەریکی دروستکردنی ساتر و هەڵدانەوەی خۆڵ بوون.

ئیتر ئەوەبوو ئامیر فەسیل ئێمەی کردە چەند تیمێک و قازمە و خاکەناسیشی بەسەر دابەشکردین و پێی وتین: گوێتان لە ئامیر سریە بوو، دەبێ پێش خۆرئاوابوون ئەو چاڵانە تەواوکەن، دەنا سزاتان دەدەم.

من و تاهیر و عوسمان و فاتح بوینە تیمێک و بە ئامیر فەسیلمان وت ئێمە بە هەرچوارمان چاڵێک لەو چاڵانە ئامادە دەکەین.

تاکو نزیکی نیوەڕۆ خەریکی چاڵ لێدان بووین، بە هەرچوارمان تەنها نیو مەتر زەویمان پێ قووڵکرا. ڕووم لە هاوڕێکانم کرد و پێم وتن: برادەران، وا بڕوات شەویشمان بەسەردا دێت، هەر تەواو نابین.

وتیان: ئەی چی بکەین باشە؟

وتم: دەچمە لای یەکێک لە شوفێری ئەو شۆفەلانە، بۆ نانی نیوەڕۆ لەگەڵ خۆم دەیانهێنمەوە.

تاهیریش وتی: تۆ شتێکت لە مێشکدایە، بەڵام نازانم ئەو شتە چییە!
منیش وتم: کە شوفێرەکەم هێنایە سەر خوانەکە، بەهەرچوارمان خزمەتێکی باشی دەکەین، خواردنێکی بە لەزەتیشی دەرخوارد دەدەین. کە ویستی بڕوا، من داوای لێدەکەم کە دەمە شۆفەڵێک خۆڵمان لەناو چاڵەکە بۆ دەربێنێت. بێگومان ئەویش لەشەرمان هەندێکمان بۆ قووڵ دەکات. کە ویستی بەجێمان بێڵێ، یەکێک لە ئێوە داوای لێبکەن کە دەمێکی تریشی لێبدات و هەندێکی تر خۆڵمان بۆ دەربهێنێ.
بەم شێوەیە دوای ئەوەی بەقسەمان دەکات، تەواوێک قووڵی دەکات، ئەوکات من پێی دەڵێم (تۆ چاکەی خۆت لەگەڵ کردووین، سوپاسگوزارت دەبین ئەگەر تەواوی کەیت و چاڵەکەمان بەتەواوەتی بۆ ڕێکبخەیت).
بەم شێوەیە ئەو ئەرکەمان لەکۆڵ دەبێتەوە و لە سزا و جوێنی ئامیریش ڕزگارمان دەبێت.
ئیتر ئەوەبوو تاکو من چووم شوفێرێکم بە خۆی و شۆفەڵەکەی لەگەڵ خۆم هێنا، ئەوانیش هێلکە و ڕونێکی زۆریان دروستکرد، چایەکی خەستیشیان لەسەر ئاگر لە دێم دانابوو.
هەروەکو چۆن پلانمان دانابوو، وامانکرد. شوفێرەکە دوای نانخواردن، بە شۆفەرەکەی بە چاوترووکانێک چاڵەکەی بۆ قووڵکردین.
سەربازی تیمەکانی تر لەماندووبوونان ئارەقەیان لە هەموو لەشیان بەدەردابوو، ئەو شوێنەی بۆیان دیارکرابوو، تاکو ئێوارەش نیوەیان قووڵ نەکردبوو. ئێمەش بە کەمالی ئیسراحەت لێمان پاڵدابۆوەو گاڵتەو گەپمان دەکرد. هەر لەو کاتەدا ئامیر سریە وەکو هەڵۆ گەیشتە سەرمان و بە جوێنە پیسەکانی ئێمەی شۆردەوە و وتی: لەجیاتی چاڵەکەتان تەواو

بکـــەن، لێــرە دانیشــتون و قســەی زل دەکــەن.
منیــش وتــم: گــەورەم ئێمــە دەمێکــە ئیشــی خۆمــان تەواوکــردووە بۆیــە دانیشــتووین.
کــە ئەمــەم وت، ســەری ســوڕما، چــووە شــوێنەکە و بــە تووڕەیییــەوە وتــی: ئەمــە بــە کاری ئێــوە ناچێــت، نــاکات بــە شــۆفەڵ هەڵتانکەندبێــت؟
منیــش وتــم: بەڵــێ گــەورەم یەکێــک لــە شــوفێرەکان یارمەتــی دایــن، بــە شــۆفەڵەکەی بــۆی هەڵکەندیــن.
کــە ئەمــەم وت، ئامیــر چاوەکانــی چوونــە پشــتی ســەریەوە، لــە نزیــک شــوێنی خۆمــان، بــە دار حەیزەرانەکــەی شــوێنێکی تــری بــۆ نیشــانکردین و وتــی: وەکــو ســزایەک نابێــت دەســت هەڵبگــرن هەتــا ئــەم چاڵــە هەڵنەکەنــن و تــەواوی نەکــەن.

# خۆم بریندارکرد

دوای چەند ڕۆژێک، وەزارەتی بەرگریی عێراق هێزێکی زۆری لە نزیک وەحدەکەی ئێمە جێگیر کرد و لە پشتەوەی هێزەکانی ئێمەش هەندێک تۆپی دوورهاوێژیان بڵاوکردەوە. هەر لەو ماوەیەشدا چەند جارێک فەریقی ڕوکن عەبدولجەبار شەنشەل سەرۆک ئەرکانی سوپا سەردانی ئە و هێزانەی کرد، لە ساترەکانی ئێمەشەوە، بە دووربینی تایبەتی تەماشای هێزە ئێرانییەکانی دەکرد.

ئێرانییەکانیش ئاڵایەکی گەورەی کۆماری ئیسلامییان لە بەرامبەر سەنگەرەکانی ئێمە بەرز کردبۆوە. لە ئێوارەشەوە تاکو بەیانی سروودی نیشتمانییان لێدەدا و بە بڵندگۆیەکانیان هەراسانیان کردبووین.

وا پێدەچوو، بەتەمای هێرشێکی گەورەبن بۆ سەر هێزەکانمان، بۆیە سوپای عێراقیش لەو ناوچەیە لە ئامادەباشیدا بوو.

ئەم بارودۆخە زۆری نەخایاند، بەرەبەیانێکی زوو، هێشتان ڕۆژ بە تەواوەتی سەری خۆی دەرنەهێنابوو، هێرشیان کردە سەرمان و چەند دەبابەیەکی کەتیبەی سوپای عێراقیان تێکشکاند. بۆیە فڕۆکە سەمتییەکانی سوپای عێراقیش هێرشەکانیان بۆ سەر سوپای ئێرانی چڕتر کردبۆوە.

سوپای ئێران بە هەماهەنگی لەگەڵ سوپای پاسداران و فەیلەقی بەدر لەو هێرشەدا بەشدار بوون. سوپای پاسداران کۆمەڵێک گەنجیان بە کفنی سپییەوە خستبووە پێش سوپاکەیان و بە دروشمی (اللە اکبر خومێنی ڕەهبەر) بەرەو سەنگەرەکانی ئێمە دەهاتن.

ئەگەر لەبەر ئەو فرۆکە سەمتییانە و تۆپخانە و ڕاجیمە ڕووسییەکان نەبوایە، هێندەی نەمابوو بگەنە سەرمان و تێکمان بشکێنن. هەرچەند کوژراو و بریندارێکی زۆرمان دا، بەڵام لیوای دەی سوپای عێراقی کە بۆ یارمەتی ئێمە هاتبوو، توانی بیانشکێنێت و پاشەکشەیان پێبکات.

یەکەم جار بوو، شەڕی ڕووبەڕوو بکەم، ئەبو وەندی عەریف فەسیڵمان کە ماوەیەکی کەم بوو هاوسەرگیری کردبوو، چاوەڕێی ئیجازە بوو تاکو بچێتە ناو قەفەزی زێڕین و لەگەڵ خۆشەویستەکەی لە مانگی هەنگوینی کاتێکی خۆش بەسەرببات، لەگەڵ چەند سەربازێکی تر لەو شەڕەدا شەهید بوون، بە شەهیدبوونی ئەبو وەندی زۆر دڵتەنگ بووم، ئەو خەڵکی شارۆچکەی بەعقوبە بوو، گەنجێکی ڕوح سووکی بە ڕەگەز عەرەب بوو، لەگەڵ دەسگیرانەکەی بە خۆشەویستی لە کۆلێژ یەکترییان ناسیبوو. کوشتنی ئەو زۆر کاری تێکردم، چونکە هەمووجارێک ئەو دڵی ئێمەی دەدایەوەو لەکاتی دەرچوونمان بۆ کەمین و دەورییەی قیتالی، شتی بەنرخ و وەسیەتنامەکانمان لای ئەو دادەنا. منیش ماوەیەکی زۆر نەبوو هاوسەرگیریم کردبوو، تاقە کچێکی بچکۆلانەم هەبوو، ئێمەش وەکو ئەبو وەندی بەخۆشەویستی هاوسەرگیریمان کردبوو، حەزم نەدەکرد بکوژرێم و بەتەنیا بەجێیان بهێڵم. بۆیە بڕیارم دا ئەگەر لەو شەڕە بە سەلامەتی دەربچم، لە دەرفەتێکی نزیکدا بە دەستی خۆم، خۆم بریندار بکەم، لەو شەڕە نەگریسە خۆم ڕزگاربکەم.

یەکێک لە سەربازەکان کە لەگەڵ ئێمە لە سەنگەردا بوو، لەترسان میزی بەخۆیدا کرد. هەندێکی تریش وەکو ژووژک لەترسان سەری خۆیان خستبۆوە ناو لەشیان.

کە شەو هات، من و تاهیر لە دوو شوێنی چاودێری لە نزیک یەکتری پاسەوان بووین. ئامیر فەسیڵ سەنگەرەکانی پێشەوەی بەسەردەکردەوە، هاتە لای من و تاهیر، پێی وتین: زۆر وریابن، زانیاریی هەواڵگریمان پێگەیشتووە، هێزەکانی ئێران ئەمشەو جارێکی تر پەلامارمان دەدەنەوە. ئەگەر گوێتان لە تەقە بوو، یان هەستتان بە جووڵەیەکی نائاسایی دوژمن کرد، لەلایەن منەوە فەرمانی تەقەکردن و بەرگریکردنتان لە خۆتان هەیە.

ئیتر ئەوەبوو، نزیک کاتژمێر دەی شەو، دەورییەکی قیتالی ئێرانی لە سەنگەرەکانی ئێمە نزیک بۆوە، سەربازەکانی ئێمەش تەقەیان لێکردن و کردیانە ڕۆژی حەشر. منیش ئەم هەلەم بە دەرفەتێکی زێڕین زانی، چوومە لای تاهیر و پێموت: چیتر توانای بەرگەگرتنم نەماوە، ئەم شەڕە نەگریسە بۆتە دێوەزمە و ناوە ناوە هەندێکمان دەکاتە قوربانی، ناتوانم چاوەڕێی ئەو ڕۆژە ڕەشە بکەم تاکو چارەنووسی منیش وەکو چارەنووسی ئەبوو وەندی و هاوڕێ شەهیدەکانی تری لێدێت. تۆ نزیکترین هاوڕێمی کە پشتت پێببەستم و بڕوات پێبکەم، داوایەکم لێت هەیە؟

وتی: ناموسی لێ بچێتە دەرەوە، هەر داوایەکت هەبێ، بۆتی دەکەم.

وتم: لە دوری چەند مەترێکەوە، بە چەکەکەی خۆم تەقەم لێبکە و فیشەکێک لە دەستی چەپم بدە، برینـدارم بکە، دواییش بارووده سووتاوەکەی ناو لوولەی چەکەکە خاوێن بکەوە و چەند مەترێک لێم دووربکەوە، منیش ئەوکات هانا بۆ تۆ دێنم و بە دەنگی بەرز هاوار دەکەم دەڵێم (فریام کەون، برینداربووم). تۆش لەجیاتی بەرەو لای من بێیت، بڕۆ لای سەربازەکانی تر و بۆلای من بیانهێنە، تاکو گومانمان لێ

نەکـەن، هـەر وابزانـن بـە فیشـەکی سـەربازە ئێرانییـەکان بریـندار بوومـە.
تاهیـر چاوەڕێـی ئـەم داوایـەی لـێ نەدەکـردم، بەسەرسـوڕمانەوە وتـی: چـۆن دڵـم دێ برینـدارت بکـەم، لەجیاتـی ئـەوەی تـۆ داوای گیانـم لێبکەیـت چـۆن داوایەکـی وام لێدەکەیـت؟
منیـش وتـم: ئەگـەر دەتـەوێ بـە هاوسـەر و کچـە تاقانەکـەم شـاد ببمـەوە، ئەمـەم بەقسـە بکـە، ئەگـەر دەشـتەوێ چارەنووسـی منیـش وەکـو ئەبـو وەنـدی و هاوڕێکانـی ترمـان بێـت، ئـەوا بـە ئـارەزووی خـۆت بکـە.
تاهیـر کەسـێک بـوو، زۆر بـاوەڕی بـە چارەنـووس هەبـوو، هـەر جارێـک ڕووبـەڕووی مەترسـی ببوونایتـەوە، دڵـی دەدایـنـەوە و دەیـوت (ئـەوەی لـەلای خـواوە بێـت، هـەر دێـت، ئەگـەر لـە بورجـی عاجیـش خۆمـان حەشـار بدەیـن). ڕووداوێکـی بەبیـر هێنامـەوە کـە هەردووکمـان بەسەرسـوڕمان لـەو ڕووداوە لـە کـوژران ڕزگارمـان بـوو، وتـی: بەبیرتـە ماوەیـەک پێـش ئێسـتا بـەدوای ئـاودا دەگەڕایـن بـۆ خۆشوشـتن، چووینـە ناوچەیـەک پێـی دەوتـرا (ناوچـەی بـاڵا خانـەکان) شـوێنی مەشـقی فڕۆکەوانـی ئێرانییـەکان بـوو. ئـەو شـوێنە کەوتبـووە دەسـت سـوپای عیـراق و لەگـەڵ زەوی تەختـی کردبـوو، ئینجـا لێـی کشـابۆوە؟
وتم: مەبەستت چییە؟
وتـی: ناوچەکـە بیابـان بـوو، مـن و تـۆش هیـچ شـتێکمان لەبـارەی سـەرابی بیابانـەکان نەدەزانـی، کـە بـە دووربیـن سـەیرمانکرد، وامانزانـی دەریـای لێیـە، بۆیـە خۆمـان لـە سـەربازەکان دزیـەوە و چەنـد کاتژمێرێـک بـە قـاچ ڕۆیشـتین، تـا گەیشـتینە ئـەوێ. تاکـو دەڕۆیشـتین، دەریایەکـەش لێمـان دووردەکەوتـەوە. دوایـی بەبـێ ئـەوەی بزانیـن ئـەوەی لـە دوورەوە دەیبینیـن، سـەرابە، لـە شـوێنی

خۆمـان ڕاوەسـتاین و بەبـێ ئومێـدی ویسـتمان بـۆ سـەنگەرەکانمان بگەڕێینــەوە، کەچــی لــەو کاتــەدا ئیرانیــەکان چاودێــری ئێمەیــان کردبــوو، ئێمەیــان دایــە بــەر مووشــەکی ڕاجیمــە دوورهاوێژەکانیــان و لــە تۆزیــان وەردایــن.
قســەکەم پێــی بــڕی وتــم: زۆر باشــم لەبیــرە، ئەگــەر گوێیەکانــی خــۆم نەگرتبــا، لەگــەڵ دەنگــی تەقینــەوە یــەک لــەدوا یەکەکانــی ئــەو مووشــەکانە، پــەردەی گوێیەکانــم دەتەقیــن.
ئەویــش وتــی: ئەگــەر کاتمــان تــەواو بوایــە، لــەو ڕووداوە ڕزگارمــان نەدەبــوو، تەنانــەت لــەو بیابانــە چۆڵــە، کەســیش بــە شــوێنی تەرمەکەمانــی نەدەزانــی.
منیــش وتــم: بــاوەڕم بــە چارەنــووس هەیــە، بــەڵام نامــەوێ ببمــە ســووتەمەنی شــەڕێکی خۆتڕێــن، کــە دیــار نییــە کــەی تــەواو دەبێــت و چارەنووســی منیــش چــی دەبێــت، ئایــا لــەو شــەڕەدا دەکوژرێــم، یــان بەدیــل دەگیرێــم!!
کــە ئەمــەم وت، ڕازی بــوو، دەســتم بکاتــە نیشــانە و بــە چەکەکــەی خــۆم تەقــەم لێبــکات و برینــدارم بــکات.
تاهیــر نیشــانگرێکی لێهاتــوو بــوو، کــە نیشــانی لــە دەســتم گــرت، بــە یەکــەم فیشــەک ئامانجەکــەی پێــکا و گولەکــەی لــە پشــتی دەســتمدا و گشــت ئێســقانەکانی تێکشــکاند.
کــە فیشــەکەکە بەردەســتم کــەوت، دەتــوت بەردێکــی گەورەیــان بــە تونــدی لەدەســتم دا. قورســاییەکی زۆر بــەر دەســتم کــەوت. ســەرەتا هەســتم بــە هیــچ ئێــش نەکــرد، بــەڵام دوایــی دەســتم زۆر قــورس بــوو، هەروەهــا زۆر ژانیکــرد. بــەڵام دانــم بەخۆمــدا گــرت، تاکــو تاهیــر تــەواو لێــم دوورکەوتــەوە. ئینجــا بــە دەنگــی بــەرز هاوارمکــرد: فریــام کــەون، برینــدار بــووم فیشــەک بــەر دڵــم کەوتــووە).

تاهیریش بەپێی ئەو پلانەی کە بە یەکەوە دامانناببوو، هانای بۆ سەربازەکانی تر برد، ئەوانیش ئامیر فەسیڵیان ئاگادارکردەوە و هەموویان هاتنە لام و سەیری برینەکەیان کرد.
منیش دەستم خستبووە سەر دڵم و هاوارم دەکرد دەموت (ئای باوکە دڵم، ئای باوکە دڵم).
ئامیر فەسیڵ کە سەیری سینگی کردم، بە پێکەنینەوە وتی:
ئەبو شوارب وامزانی تۆ زۆر ئازا و بوێریت نەمزانی ئەوەندە ترسنۆکیت تۆ دەستت بریندار بووە نەک دڵت.
ئیتر ئەوەبوو، هەر بەو شەوە بە جێبێکی قیادە منیان گەیاندە نەخۆشخانەی سەربازی لە شاری بەسرە. لەوێ دەستیان تەداوی کردم و بە لەفاف بۆیان پێچامەوە.
هەر لەکاتی تەداوی کردنیش، لیژنەیەکی پزیشکی تەماشای برینی دەستیان کردم. یەکێک لەو کارمەندانەی کە لەگەڵ لیژنەکە بوو، یاریدەدەری پزیشکی عەبدولباسیت محەمەد ئەمین هاورێی منداڵی و خەڵکی گەڕەکەکەمان بوو.
دوای لێکۆڵینەوە، پزیشکەکان سەریان خستە ژێر گوێی یەکتری، تاکو من لێیان تێنەگەم کە چی دەڵێن، بە زمانی ئینگلیزی قسەیان لەگەڵ یەکتری دەکرد. هەر لەو کاتیش عەبدولباسیت سەری خستە ژێر گوێی سەرۆکی لیژنەکە و پێی وت (گەورەم ئاگات لەو سەربازە بێت، هاورێی منداڵی و خەڵکی یەک گەڕەکین).
دوای تۆزێک، سەرۆکی لیژنە ڕووی لە من کرد و پێی وتم:
کوڕم تۆ لە دوورەوە بە فیشەکی قەناس بریندار کراویت، هەر بۆیە شوێنی برینەکەت زۆر گەورەیە، بەڵام ستایش بۆ خوا کە فیشەکەکە بەر شوێنێکی مەترسیدارت نەکەوتووە.
بەم شێوەیە، دوای تەداویکردن و پێچانەوەی، لە زەرفێکدا

سێسەد دیناریان بە پاداشت دامێ، هەروەها یەک مانگ ئیجازەیان بۆ کردم و پێیان وتم: کە گەڕایتە ماڵەوە بۆ چارەسەر، لە شاری هەولێر سەردانی نەخۆشخانەی سەربازی بکە، تاکو بەتەواوەتی چاک دەبیتەوە، هەر لەوێ ئیجازەت بۆ درێژ دەکەنەوە.
کە لە دەرگای نەخۆشخانە هاتمە دەرەوە، لەخۆشییان قاچەکانم زەوییان نەدەگرت. زۆر برسیم بوو، لە بەیانییەوە هیچم نەخواردبوو، بۆیە خۆم گەیاندە چێشتخانەیەک، دوو قاپ برنج و فاسولیام خوارد، دوایی چوومە وێستگەی شەمەندەفەر و بە شەمەندەفەر گەڕامەوە شاری بەغداد.
پێش ئەوەی بچمە گەراجی نەهزە، پیاسەیەکم بەناو شاری بەغداد کرد، لە ساحەی تەحریر بە تەلەفۆنی گشتی سەرشەقام تەلەفۆنم بۆ باوکم کرد پێموت: لە بەرەکانی جەنگ بریندار بوومە، بەڵام برینەکەم سووکە و بۆیان تەداوی کردوومە، ئەمرۆ دەگەڕێمەوە لاتان. ئەم هەواڵە بە هاوسەرەکەم بگەیەنن و پێشی بڵێن خەفەت نەخوات من سەلامەتم.
کە ئەمەم وت، باوکم بە پێکەنینەوە وتی: خەمی ئەوانت نەبێ، پێیان دەڵێم کە تۆ باشیت، بەراز بە گوللەیەک ناکەوێ.
دوای ئەوە بەرەو شەقامی ڕەشید ڕۆیشتم، چوومە ئۆرزدی باکەکەی بەرامبەر شەقامی سوڵتان عەلی. چوومە ئۆرزدییەکە، بووکە شووشەیەکی جوانم کڕی بۆ ژاڵەی کچم. ئینجا یاغر یاغر بەرەو گەراجی نەهزە شۆڕ بومەوە و بە پاسێکی گەشتیاری گەڕامەوە شاری هەولێر.
کە گەیشتمە هەولێر، لە ڕێگای چوونەوەم بۆ ماڵی خۆمان لە گەڕەکی موفتی، چاوم بە دیمەنێکی تراژیدی کەوت. خانووی کەسێک لە گەڕەکەکەمان لە ئەنجامی بۆردومانی فڕۆکەکانی

ئێــران، وێــران ببــوو. زۆر خەفەتــم بــۆی خــوارد، خــاوەن مــاڵ ئەندازیارێکــی گەنــج بــوو نــاوی ســوداد بــوو ماوەیەکــی کــەم بــوو لەگــەڵ ناســیاوێکی خــۆی هاوســەرگیری کردبــوو.
کــە چوومــە ماڵــەوە، هاوســەرەکەم باوەشــی پێداکــردم، لــە خۆشــییان دەســتی بەگریــان کــردو وتــی: ســتایش بۆخــوا کــە جارێکــی تــر بــە زیندوویــی گەڕایتــەوە ناومــان. ئەمجــارە چاکیــش ببیتــەوە، لێناگەڕێــم بگەڕێیتــەوە ســەربازی. نــەوەک وەکــو قاســمی بــرام بــێ سەروشــوێنبیت و منداڵەکانیشــم بــە هەتیــوی بمێننــەوە.
منیش وتم: ناکات قاسم شتێکی بەسەرهاتبێت؟!
بەچــاوی گریانــەوە وتــی: لــەدوای تــۆ هەواڵمــان بــۆ هــات کــە لــە شــەڕی بســێتین کــەس لــە وەحدەکــەی ئــەوان ڕزگاری نەبــووە، ئــەوەی کــوژراوە کــوژراوە، ئەوانــی تریــش کــەس نازانــێ بەدیــل گیــراون یــان بــێ سەروشــوێن بوونــە.
منیش وتم: کێ دەڵێ ئەم هەواڵە ڕاستە؟
وتــی: باوکــی مــن و تــۆ لەگــەڵ بەکــری ســەرەخۆرە بــۆ هــەواڵ پرســین بەیەکــەوە ڕۆیشــتنە وەزارەتــی بەرگریــی عێــراق بەڕێوەبەرێتــی ئیــدارەو تەمویــن، پــاش ئــەوەی دڵنیابیــوون لــە ونبوونــی ئەوجــا گەڕابوونــەوە.
دڵێــم دایــەوە و پێمــوت: بــێ ئومێــد مەبــە، ئەگــەر لەچارەنووســی نووســرابێت، ڕۆژێــک وەکــو مــن دەگەڕێتــەوە و خــۆی بــەژوورەوە دەکات.
پێــش ئــەوەی دابنیشــم، پێمــوت: لــە ڕێــگای گەڕانــەوەم بــۆ ماڵــی خۆمــان، خانووەکــەی ئەندازیــار ســودادم بینــی وێــران ببــوو. پێــم ناڵێــی چــی ڕوویــداوە؟
وتــی: هەفتەیــەک پێــش ئێســتا، دوو فڕۆکــەی شــەڕکەری ئێرانــی بەســەر ئاســمانی شــاری هەولێــر دەســووڕانەوە، یەکێکیــان تــاوەری تەلەفۆنــەکان و خانــووی هاوڵاتییێکــی لــە تەنیشــت تاوەرەکــە کــردە

ئامانج، ئەوەی تریش ئەم خانووەی بۆدومانکرد و خاپووری کرد.
منیش وتم: ستایش بۆخوا کە ئێوە سەلامەتن.
ئەویش وتی: ڕاستە ئێمە هیچمان لێ نەهاتووە، بەڵام هیچ شەوێک لەترسان خەو نەچۆتە چاومان. ئەو دوو منداڵە کە گوێیان لە دەنگی سافیرەی ئینزارەکە دەبوو، لەترسان میزیان بەخۆیاندا دەکرد.
ماوەی چەند مانگێک بۆ چارەسەریی دەستم سەردانی نەخۆشخانەی سەربازیم کرد، هەر جارێکیش ئیجازەکەم تەواوبا، بۆ ماوەی یەک مانگ بۆیان درێژ دەکردمەوە. هەر لەو ماوەیەشدا، تاهیر لە سەربازی ڕایکرد و خۆی گەیاندە ماڵەوە. کە چوومە سەردانی، دەستێکی لە کۆنکریت گیرابوو، لەسەر جێگا ڕاکشابوو، هاوسەرەکەی خزمەتی دەکرد.
پێموت: ناکات دوای من تۆش بریندار بوو‌بیت؟
سەری هێنایە ژێر گوێم و بە ئەسپایی پێی وتم (دوای تۆ نەمتوانی بەرگە بگرم، خۆم دزیەوە و لەگەڵ ئیڤای ئیعاشە چوومە بەسرە، لەوێش چوومە کارگەیەکی کاشی، هەندێک چیمەنتۆی سپیم لێیان وەرگرت و لە پەنایەک دوای گرتنەوەی، لەگەڵ لەفافێک لەدەستی خۆمم گرت. ئینجا چوومە وێستگەی شەمەندەفەر و گەڕامەوە شاری بەغداد و لەوێش تەلەفۆنم بۆ باوکم کرد و پێموت (لە ڕێگای گەڕانەوەم، بە ڕووداوی هاتوچۆ دەستم شکاوە و ئیجازەیان داومەتێ، لەڕێگام، پاش چەند کاتژمێرێکی تر دەگەمە جێ).
کە ئەمەی وت، زۆر پێکەنینم هات، وتم: تۆ لە من زیرەکتر بوویت، من دەستێکی خۆم سەقەت کرد، تا لە سەربازی ڕزگارم بێت، بەڵام تۆ بە ساغ و سەلامەتی گەڕایتەوە.

وتــی: لــه ترســی باوکــم و دراوســێکانم دەســتم لــه چیمەنتــۆ گرتــووه، ئەگــەر بزانــن لــه ســەربازی ڕامکــردووه، هــەر زوو خەبــەری حکومەتــم لێــدەدەن. تــا ماوەیــەک بــەم شــێوەیە لێــی دەگەڕێــم، دوایــی لێــی دەکەمــەوه. ئــەو ئیجــازەی کــه تــۆ لــه نەخۆشــخانه وەریدەگریــت، لێــت وەردەگــرم، وێنەیەکــی لــێ کۆپــی دەکەمــەوه و لەجیاتــی نــاوی تــۆ، نــاوی خۆمــی لــێ دەنووســمەوه و پیشــانی خــزم و کەســه نزیکەکانمــی دەدەم تاکــو گومانــم لــێ نەکــەن.

ڕۆژێــک لــه نەخۆشــخانه بــووم، چاوەڕێــی پزیشــکم دەکــرد بــۆ چارەســەری دەســتم. لــەو کاتــەدا کەســێکیان بــه عەرەبانەیەکــی نەخۆشــان هێنــا لای پزیشــک. دەســتێک و قاچێکــی لەشــەڕ لەدەســت دابــوو. کــه لێــی نزیــک کەوتمــەوه، ئــەوم ناســی، ڕەشــاد کارەباچــی بــوو. پێــش دوو ســاڵ کارەبــای خانووەکــەی ئێمــەی بەســت، زۆر فــرت و فێڵــی لێکردیــن، هاوسەرەکەشــم لــه ڕقــان نــزای لــه خــوا کــرد، تۆڵــەی ئێمــەی لێبکاتــەوه و ئــەو دەســتانەی کــه پلاییســی پێگرتــووه، هەروەهــا ئــەو قاچانــەش کــه پێــی بەســەر قاندرمەکــه کەوتــووه، لەبــری ئــەو فــرت و فێڵانــەی کــه لێــی کردوویــن، ببڕێتــەوه.

جــا کــه ئــەو دیمەنــەم بینــی، هەرچەنــده دیمەنێکــی تراژیــدی بــوو، بــەڵام کــه نــزای هاوســەرەکەمم بیرکەوتــەوه، پێکەنینــم هــات، لەبیــری خۆمــدا وتــم (هەقــی هیــچ کەســێک لەســەر یەکتــری نامێنێتــەوه، ئەوەتــا ئــەو کارەباچییــه ســاختەچییە ئەگــەر بیزانیبــا ڕۆژێــک دێــت وای بەســەردێت، هەرگیــز فێڵــی لــه کــەس نەدەکــرد).

بەهەرحــاڵ، پــاش ئــەوەی چەنــد مانگێــک ئیجــازەم وەرگــرت، هــەر لــەو ماوەیەشــدا لــه بەشــی فیزیــک چارەســەری سروشــتییان بــۆ دەکــردم، هەندێــک جووڵــەی وەرزشــییان بــه دەســت و پەنجەکانــم کــرد، تــا وەکــو جــاران ئاســایی بوونــەوه. ئینجــا نووســراوێکیان بــۆ

کـردم و کـە بگەڕێمـەوە وەحدەکـەم و لـە بەرەکانـی جەنـگ درێـژە بـە خزمەتـی سـەربازی بـدەم.

مـن بڕیـاری خـۆم دابـوو، کـە نەگەڕێمـەوەو بەبیانـووی چارەسـەری پزیشـکی، ئـەو ڕاسـتییە لـە هەمـوو کەسـێک بشـارمەوە. ماوەیەکـی زۆر بـە ڕاکردوویـی لـە ماڵـەوە مامـەوە، بەبـێ ئـەوەی کـەس بزانێـت ئیجازەکـەم تـەواو بـووە.

وەکـو وتـم ئـەم شـەڕە نەگریسـە زۆری خایانـد، ڕۆژ لـەدوای ڕۆژ ئاگرەکـەی خۆشـتر دەبـوو، ڕۆژانـەش تەرمـی دەیـان شـەهید لـە بەرەکانـی جەنـگ بـۆ شـار و شـارۆچکە و گونـدەکان دەگەڕایـەوە، تەرمـی هـەر شـەهیدێک لـەو شـەهیدانە بۆخـۆی چیرۆکێـک بـوو. تەرمێـک، لەنـاو سندووقێک، بـە ئـاڵای عێـراق پێچرابـۆوە، بـۆ ماڵـی مـام ئەحمـەدی دانیشـتووی گەڕەکەکـەی ئێمەیـان هێنـا. تەرمەکـە زۆر شـێوابوو، بۆیـە ئەسـتەم بـوو بناسـرێتەوە کـە ئـەوە تەرمـی کوڕەکـەی مـام ئەحمـەدە. دوای ئـەوەی بەخـاک سـپێردراو پرسـەی بـۆ دانـدرا، دوای ماوەیـەک لەگـەڵ پۆلێـک دیلـی جەنـگ نـاوی لـە ئێزگـەی تـاران خوێندرایـەوە و چاوپێکەوتنـی لەگـەڵ کـرا. هەروەهـا یەکێکـی تـر لـە دراوسـێکانمان کـە نـاوی بـە شـەهید گەڕایـەوە، ژنەکـەی هاوسـەرگیری لەگـەڵ شـووبراکەی خـۆی کردبـۆوە. بـەڵام دوای ماوەیـەک نـاوی ئەویـش لەگـەڵ دیلـەکان لـە ئێزگـەی تـاران خوێندرایـەوە و دەرچـوو ئـەو تەرمـەش کـە بۆیـان هاتۆتـەوە هـی سـەربازێکی تـر بـووە و لەبـەر شـێواوی نەناسـراوەتەوە.

هیـچ ئومێدێـک نەبـوو شـەڕ ڕابووەسـتێ، بۆیـە سـەربازێکی زۆر لـە بەرەکانـی جەنـگ ڕایانکـرد، هەندێکیـان چوونـە شـاخ و پەیوەندییـان بـە ڕیزەکانـی پێشـمەرگەوە کـرد، ئەوانـی تریـش هەندێکیـان چوونـە دەرەوەی وڵات، هەندێکـی تریـش لـە ماڵەکانـی خۆیـان بـە ناچـاری مانـەوە.

هەر لەو ماوەیەدا، حکومەت کە زانی بە دەیان هەزار کورد لە بەرەکانی جەنگ رایانکردووە و بەشێکیش لەوانە پەیوەندییان بە نەیارەکانی حکومەتەوە کردووە، بۆیە بڕیارێکی بۆ دەرکردن. بەپێی بڕیارەکە ئەو سەربازەی لە بەرەکانی جەنگ رایکردووە، دەتوانێ پەیوەندی بە نزیکترین مەدرەسە قیتالی شارەکەیەوە بکات، لەجیاتی گەڕانەوە بۆ وەحدەکەی خۆی، لە وەحدەیەکی نزیک شوێنی دانیشتنی تەنسیب بکرێت.

ئەم بڕیارە هاندەرێکی باش بوو، کە زۆربەی ئەو کوردانەی کە لە بەرەکانی جەنگ رایانکردبوو، ئەوانە کە نەچووبوونە شاخ، هەروەها خۆشیان لە فەوجی جاشان ناونووس نەکردبوو، بگەڕێنەوە وەحدەیەکی نزیک شار و شارۆچکەی خۆیان.

من و تاهیریش چووینە مەدرەسەی قیتالی شاری هەولێر، هاوڕێیەکم ناوی شێرزاد نانەکەلی بوو، لەوێ لە قەڵەم کاری دەکرد، لای ئەو خۆمان تۆمار کرد. دوای ناونووسکردنمان، ئێمەیان ریز کرد و لێیان پرسین کە بڕوانامەی چیمان هەیە و شارەزاییشمان لە چی بوارێکدا هەیە، هەتا لە شوێنێکی گونجاو تەنسیبمان بکەن.

منیش بە تاهیرم وت: لێرە کەس بەکەس نییە، دەڵێین ئێمە دەرچووی پەیمانگای پزیشکین، لە بنکەی تەندروستیش کارمان کردووە.

تاهیر بیرۆکەکەی زۆر پێباش بوو، بۆیە هەردووکمان خۆمان بە یاریدەدەری پزیشکی ناساند، ئەوانیش بەنووسراوێک ئێمەیان رەوانەی نەخۆشخانەی سەربازی شاری هەولێر کرد.

کە چووینە نەخۆشخانەی سەربازی، هەر لەوێ هاوڕێیەکی تریشم بینی، ناوی شەمسەدین بوو، خۆی بە شێخ بزێنی هەڵدەدایەوە، پێشتر لە پەروەردەی هەولێر فەرمانبەر بوو،

واپێدەچـوو ئەویـش وەکـو ئێمـە خـۆی بـە کارمەنـدی پزیشـکی ناسـاندبێت، بۆیـە ئەویشـیان لـە نەخۆشـخانە تەنسـیب کردبـوو. ڕۆژانـە دەچووینـە نەخۆشـخانە، ڕەئیـس عورەفـا شـەمعون خەڵکـی شـارۆچکەی عەنکاوەبـوو، ماوەیـەک لـە سـاحەی عـەرەزات مەشـق و ڕاهێنانـی پـێ دەکردیـن. دوایـی بەسـەر قاوشـەکانی نەخۆشـخانەکە دابەشـیانکردین بـۆ دەرزی لێـدان و تـەداوی بریندارەکانـی جەنـگ.
هیـچ سـەرمان لـەو پیشـەیە دەرنەدەچـوو، بۆیـە ناچاربوویـن ڕاسـتییەکە بـە ڕەئیـس عورەفـا شـەمعون بڵێیـن. ئەویـش ئێمـەی بـردە لای بەڕێوەبـەری نەخۆشـخانەکە و ڕاسـتییەکەی پێـوت.
بەڕێوەبـەری نەخۆشـخانەکە ڕائیـد جەعفـەر قـادر، خەڵکـی شـاری هەولێـر بـوو، ناسـیاوی باوکـم بـوو، هەندێـک سەرزەنشـتی کردیـن، بـەڵام سـزای نەدایـن. ئێمـەی گواسـتەوە بـۆ فەسـیلی ئیـش و کار.
مـاوەی چەنـد مانگێـک لـەوێ ماینـەوە، دوایـی حکومـەت بڕیـاری دا ئەوکەسـانەی وەکـو ئێمـە کـە لـە سـەربازی ڕایانکـردووە و لەجیاتـی یەکـە سـەربازییەکانی خۆیـان تەنسـیبی یەکـەی سـەربازی تـر کـراون، لـە خزمەتـی سـەربازی ببەخشـرێن و تەسـریح بکرێـن. ئیتـر ئەوەبـوو، بـڕی پێنـج سـەد دینـارم دایـە حکومـەت و خـۆم کڕییـەوە و لـە سـەربازی تەسـریح بـووم و گەڕامـەوە سـەر کارەکـەم لـە ئەمیندارێتیـی شـارەوانی و هاوینـە هـەوارەکان.
هەرچەنـد، لـە سـەربازی تەسـریح بـووم، بـەڵام لـە ترسـی گرتـن و بردنمـان بـۆ جەیشـی شـەعبی زۆر ناڕەحـات ببـوم، هەمـوو ڕۆژێـک بـە تـرس و لـەرز و دڵـە ڕاوکـێ دەچوومـە دایـەرە، دڵـم لـە نـاو دەسـتم دا بـوو، نـەوەک بمگـرن و بمبـەن بـۆ بەرەکانـی جەنـگ.
ئێوارەیـەک مـن و هونەرمەنـد ئـازاد خەمـە لـە نـاو بازاڕبوویـن، کـە گەیشـتینە نزیـک چایخانـەی قـەرداران کەوتینـە نـاو بۆسـەی ڕەفیـق حیزبییـەکان. خەڵکییـان دەگـرت بـۆ جەیشـی شـەعبی،

لەسەر کەسیان پاز نە دەدا. شوێنێک نەبوو خۆمانی لێ بشارینەوە، بۆیە بە ناچاری بەناویاندا ڕۆیشتین. یەکێک لە ڕەفیق حیزبییەکان کە چاوی بە ئازاد خەمە کەوت، بە هونەرمەندی گەورە ناسر حەسەنی تێگەیشت، باوەشی پێداکرد و شانەکانی ماچ کرد و وتی: من یەکێکم لە هەوادارانی کارە هونەرییەکانت، زۆر تامەزرۆی بینینت بووم، لە ئاسمان بە دوات دەگەڕام کەچی تۆ بە ئاسانی لێرە کەوتییە بەر دەستم.

ئازاد خەمەش هیچ خۆی نەشڵەژاند، وتی: لە بەر کاری هونەری ماوەم زۆر کەمە، بۆیە دیار نیم.

ڕەفیق حیزبییەکە وتی: سەرباز بە چەک لە بەرەکانی جەنگ بەرگری لە عێراق دەکەن، ئێوەش بە هونەرەکەتان خزمەتی گەل و نیشتمان دەکەن.

ئەمەی وت و بە ڕێزەوە بەڕێی کردین. کە تۆزێک لێیان دوور کەوتینەوە، بە ئازاد خەمەم وت: بەختمان هەبوو کە تۆ بە ناسر حەسەن دەچیت و وەکو ئەویش ڕیشت بەرداوەتەوە، دەنا دەیانگرتین و دەیانبردینە بەرەکانی جەنگ.

ئەم بارودۆخە زۆری خایەند، زۆر بڕیار لە لایەن کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتییەوە بۆ دروستکردنی فشار لە سەر هەردوو لای شەڕکە دەرچوون، بەڵام بێ سوود بوو، تا دوواجار ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بە کۆی دەنگ بڕیاری ٥٩٨ ی لە ڕێکەوتی ١٩٨٧/٧/٢٠ دەرکرد و لە ڕێکەوتی ١٩٨٨/٨/٨ چووە باری جێبەجێکردنەوە، دوای ئەوەی ئایەتوڵڵا ئیمام خومێنی ڕازی بوو شەڕ ڕابگریت و لە ڕادیۆی دەنگی تاران وتی (پێم خۆشتر بوو، ژەهرم بخواردبا، نەوەک شەڕم لە گەڵ عێراق ڕابگرتبا).

هەر ئەو شەوەش ڕوشدی عەبدولساحیب بەیاننامەی قیادەی

گشتی هێزە چەکدارەکانی عێراقی سەبارەت بە ڕاگرتنی شەڕ خوێندەوە وتی (ایها المواطنون هذا بيان البيانات صادر عن القيادة العامة للقوات المسلحة، بسم الله الرحمن الرحيم ايها الشعب العراقي العظيم، يا أبنا و امتنا العربية المجيدة، ايها الرجال النشامة في قواتنا المسلحة الباسلة، انه يومكم اليوم، انه يوم الأيام، وهو في ذات الوقت بيان كل البيانات، في هذا اليوم صدر اعلان وقف اطلاق النار، وقد حدد يوم وقف الرسمي لاطلاق النار في العشرين من آب عام الف و تع مئم وثمانية وثمانين، وقد جا و ة موافقة الايران علة هذا بعد قتال استمر ثمانية سنوات قاوم فيها الشعب العراقي وقواته المسلحة الباسلة قوى البغي والعدوان بكل ما تجمع لديها من امكانات فنية ومن خبرة في الدجل والشعوذة في ايطار تعبئة الشر واستنفار الحقد في اعمق مكامنه ..................والله اكبر الله اكبر والحمد لله على نصره المبين، و ليخسأ الخاسئون، القيادة العامة للقوات المسلحة، بغداد في الثامن من اب عام الف وتسع مئة و وثمانية وثمانين ميلادي، الموافق الخامس والعشرين ذي الحجة عام الف و اربع مئة و ثمانية هجرية).

## جارێکی تر بوومەوە سەرباز و گواسترامەوە بۆ چیای قەندیل

پاش ئەوەی پارەم دا و خۆم لە سەربازی کڕییەوەو تەسریح بووم، کە گەڕامەوە سەر کارەکەم، لەو ماوەیەدا کچێکی دەرچووی کۆلێژی بەڕێوەبەری ئابووری و بەڕێوەبردنیان لە شوێنی من دانابوو، هەرچەند من لەو شارەزاتر بووم لە کاروباری خۆیەتی، بەلام لەبەر ئەوەی ئەو بڕوانامەکەی لە من گەورەتر بوو، منیان خستە ژێر دەستی ئەو. ئەمەش وای لێکردم کە بە خۆم دا بچمەوە و لە قوتابخانەی شەوان درێژە بە خوێندن بدەم. جا ئەوە بوو وەسیقەکەم بردە قوتابخانەی ئامادەیی هەولێری شەوان، لەوێ ناوی خۆم تۆمار کرد. بەڕێوەبەرەکەی ناوی مامۆستا هیشام بوو، خەڵکی شاری موسڵ بوو، کەسێکی باش بوو، هەروەها یاریدەدەرەکەشی کورد بوو ناوی فوئاد حەمید زەنوون بوو، کەسێکی کورد پەروەرو سادە و ساکار بوو. کە منی بینی هانیدام وتی (کارێکی باشت کردووە کە گەڕایتەوە بەر خوێندن، من لێت رادەبینم کەسێکی سەرکەوتووت لێ دەربچێت).

بەم شێوەیە درێژەم بە خوێندنم دا، گشت مامۆستاکانیش منیان خۆش دەویست و هاوکارم بوون، مامۆستای زمانی ئینگلیزی عومەر کۆیی مەلزەمەیەکی ئینگلیزی دامێ وتی (ئەم مەلزەمەیەم بۆ قوتابیانی خوێندنی تایبەتی داناوە، زۆر زانیاری وردو ئاسانکاریی تیایە، ئەگەر بیخوێنیتەوە، گرێنتیت دەدەمێ کە نمرەی تەواو بە دەست دەهێنیت). هەروەها مامۆستا فائق ئابووری پێ دەوتینەوە، زۆر هانی دەدام، هەر کاتێک نەچوبام بۆ قوتابخانە، بە قوتابییێک کە ناوی مەغدید بوو، بە دوای دا

دەنـاردم و لـێ نەدەگـەڕا لـە خوێنـدن سـارد ببمـەوە.
بـەم شـێوەیە، بەنمرەیەکـی بـاش قۆناغـی شەشـەمی ئامادەییـم بـڕی و لـە کۆلێـژی یاسـا لـە زانکـۆی سـەلاحەددین وەرگیـرام. مۆڵەتـی خوێندنـم بـە مووچـەی تـەواو وەرگـرت و دەسـتم لـەکار هەڵگـرت. دوای تەواوکردنـی خوێندنـی کۆلێـژ لـە ناوەڕاسـتی سـاڵی ١٩٨٩، کـە گەڕامـەوە دایـەرە، خـۆم خانـە نشـین کـرد و دەسـتم کـرد بـە ئیـش و کاری پارێـزەری.
لـە ١٩٩٠/٨/٢ سـوپای عێـراق لـە مـاوەی دوو کاتژمێـر وڵاتـی کوێتـی داگیرکـرد و سـەرکردایەتی گشـتیی هێـزە چەکدارەکانـی عێراقیـش بەیاننامەیەکـی دەرکـرد، لـە لایـەن ڕوشـدی عەبدوالسـاحیب لـە تەتەلەفزیۆنـی بەغـداد خوێندرایـەوە تیایـدا وتـی (یـا أبنـا و الکویـت الأعـزا و ، لقـد بلـغ السـیل زبـا، ولـم یبقـی فـي القـوس ثمـة تمـزی، ولـم یبقـی شـعبنا قـادرا علـی تحمـل هـذه درجـة مـن البغـي والفسـاد و والتآمـر، ان القـوی الوطنیـة التـي رفضـت البغـي والاسـتبداد و الفسـاد و قـاوت النظـام المرتبطـة بالدوائـر الاسـتعماریة والصهیونیـة قـد قـررت وبعـد الاتـکال علـی اللـه وعلـی ارادة الشـعب الحـرة و ممثلیـه الخیریـن، قـررت تسـلم زمـام المسـؤولیة و الاطاحـة بالنظـام المسـتبد الفاسـد العمیـل).
بـەم شـێوەیە، دوای گرتنـی کوێـت لـە لایـەن سـوپای عێراقـەوە، جارێکـی تـر وەزارەتـی بەرگـری داوای موالیـدی ئێمـەی کـردەوە بـۆ سـەربازی، بـەڵام ئەمجارەیـان بەخـت یـاوەرم بـوو، گواسـترامەوە بـۆ وەحدەیـەک لـە چیـا سەرکەشـەکانی کوردسـتان.
لـە مەدرەسـە قیتالـی سـلێمانی ماوەیـەک مەشـقیان پێکردیـن، دوایـی لـە قەڵـەم دایاننـام. هێشـتان بەتەواوەتـی شـوێنی خـۆم گـەرم نەکردبـوو، لەگـەڵ عەریفـی قەڵـەم بـووە دەمەقاڵێمـان، لەهیچـی خۆڕایـی لـەلای ئامیـر شـکایەتی لێکـردم. ئامریـش لای

ئـەوی گـرت و پێـی وتـم لـە نێـوان سەرتاشـین یـان گواسـتنەوەت بـۆ چیـای قەندیـل یەکێکیـان هەڵبژێـرە. منیـش لێـم بـووە عەکسـی و لـە ڕقـان چیـای قەندیلـم هەڵبـژارد. نەمزانـی ئامیـر بـە ڕاسـتییەتی، بۆیـە وام وت، بـەڵام ئامیـر جارێکـی تـر لێـی دووبـارە نەکردمـەوەو یەکسـەر منـی گواسـتەوە بـۆ ئـەوێ.

ئیتـر ئەوەبـوو گواسـترامەوە بـۆ فەوجـی شەشـی حیمایـە و حیراسـەی نەفـت لـە چیـای قەندیـل. چووینـە شـوێنێک پێیـان دەوت (لۆفەکانـی کورتـەک) لـە دۆڵـی شـەهیدان.

کـە گەیشـتینە جـێ، لـە بـارەگای فـەوج دابەزیـن، وتیـان کـێ خەریجـە؟

مـن و سـەربازێکی تـر نـاوی قارەمـان بـوو، دەسـتی خۆمـان بڵندکـرد، وتمـان (ئێمـە خەریجیـن).

ئێمەیـان گواسـتەوە بـۆ قەڵەمـی سـریەی پێنـج. سـریەکەمان میـوان بـوو لەسـەر لیـوای حەفـت سـەدو دوو. لـەوێ کاتێـک بەسـەر لۆفەکانـی کورتـەک کەوتیـن، زۆر مانـدوو بوویـن، چونکـە ڕێگایەکـی تاکـو بڵێـی ناخـۆش بـوو. زۆر خەفەتـم خـوارد، لـە دڵـی خۆمـدا وتـم (خـۆزگا بـە سـزاکەی ئامیـر ڕازی بوومایـە و ڕێـگام بدابـا نـەک هـەر سـەرم بەڵکـو سمێڵیشـیان بتاشـیمایە، بـەس بـۆ ئێرەیـان نەناردبـام).

حکومـەت خەڵکـی گوندەکانـی ناوچـەی قەندیلـی بـۆ شـوێنێکی تـر گواسـتبۆوە، بۆیـە ئـەو ناوچەیـە لـە ئـۆردوگای حیزبـی دیموکراتـی ئێرانـی و بارەگاکانـی سـوپای عێراقـی بـەولاوە کەسـی تـری تیـا نەدەژیـا. کـە ئێمـە چووینـە ئـەوێ، هەنـدە نەبـوو خەڵکـی ئـەو گوندانەیـان ڕاگوێزابـوو، بۆیـە دەغـڵ و دانەکانیـان هێشـتان نەدووریبـۆوە. سەنگەسـەر و سـکتان و گۆپتـان، هـەر هەمـووی چۆڵکرابـوو.

کوردێکمـان لەگـەڵ بـوو، نـاوی وەسـمان بـوو، لەگـەڵ ئـەو لـە بـارەگای سـریە ماینـەوە. ئامیـر سـریەکەمان نـاوی لەفتەبـوو، ڕۆژانـە دوو کاتژمێـر مەشـقی پێدەکردیـن، دواییـش تـا نیـوەی شـەو ئیـش و کاری قەڵەمـی پێدەکردیـن. ئەرکەکانمـان زۆر قـورس بـوو، لەبـەر ئـەوەی زۆر شـارەزای ناوچەکـە نەبوویـن.

هەندێـک بلـۆک لەبـەردەم ژووری قەڵـەم کەڵەکـە کرابـوون. ئامیـر فەسـیڵ وتـی: ئـەم بلۆکانـە بـۆ شـوێنێکی تـر بگـوازەوە؟

منیش وتم: من لە قەڵەم ئیش دەکەم، ئەم بلۆکانە هەڵناگرم.

لەسـەر گواسـتنەوەی ئـەو بلۆکانـە لەگـەڵ ئامیـر فەسـیڵ بـووە دەمەقاڵێمـان، کردمـە عینـادی و نەمگواسـتنەوە. ئامیـر فەسـیڵ کـە زانـی کەللەڕەقـم و بەگوێـی ناکـەم، بەرامبـەرم نەرمـی نوانـد، وتـی: کێشـە نییـە، بـا ئەمجـارە بەدڵـی تـۆ بێـت، بـەڵام ئامۆژگارییێکـم بـۆت هەیـە، لەمـەودوا کوڕێکـی بـاش بـە، دەنـا دەتبەمـە لای ئامیـر و پێـی دەڵێـم بـۆ شـوێنێکی خراپتـر بتگوازێتـەوە.

منیـش وتـم: ئـەم بلۆکانـە ناگوازمـەوە و هیـچ منەتیشـت نازانـم، چیـت لەدەسـت دێـت بـێ منـەت بـە بیکـە.

کـە ئەمـەم وت، زۆر لێـم تووڕەبـوو، منـی دایـە پێـش خـۆی، منـی بـردە لای ئامیـر سـریە و پێـی وت: گـەورەم ئـەم سـەربازە فەرمانـە سـەربازییەکان جێبەجـێ نـاکات.

ئامیـر سـریەش ڕووی تێکـردم و پێـی وتـم: تـۆ بوویتـە کێشـە بـۆ مـن لـەو سـریەیەدا، بۆچـی بەقسـەی ئامیـر فەسـیڵ ناکەیـت؟

منیـش وتـم: گـەورەم ئامیـر فەسـیڵ ڕق بـە ڕقیـم لەگـەڵ دەکات، ئـەو دەیـەوێ سـووکایەتیم پێبـکات و بێـزارم بـکات بۆیـە داوام لێـدەکات ئـەو بلۆکانـە بگوازمـەوە، دەنـا شـوێنەکەیان خـراپ نییـە.

هـەر لـەو کاتـەی مـن و ئامیـر فەسـیڵ لای ئامیـر سـریە بوویـن، سـەربازێکی گێلۆکـەش لـەلای بـوو، عەلـی ڕەشـیان پـێ دەوت،

خەڵکی ناوچەی مەخمور بوو، عەرەبی باش نەدەزانی دووکەڵی دەکرد. بە عەرەبییێکی شەپرێو بەرگری لێکردم و داوای لە ئامیر سریە کرد کە بمبەخشێت.

ئامیریش لەجیاتی ئەوەی بەقسەی بکات، شەقازللەیەکی توندی لەبن گوێی دا، هەندێک جوێنی پیسیشی پێدا. دوایی بانگی قاسم زەینەلی کرد، ئەو سەرتاشی سریەکەمان بوو. سەری عەلی ڕەشی پێ سفر کرد.

عەلی ڕەش لەمن بەتەمەنتر بوو، کە سەریان سفر کرد، ڕووی لەمن کرد و وتی: چەند ساڵە سەربازم تاکو ئێستا کەس قسەیەکی خراپی پێنەوتوومە و هەرگیز سزاش نەدراوم، کەچی وا لەسەر تۆ ئامیر تێرجوێنی کردم و سەریشی سفرکردم.

ئامیر سریە پێی وتم: ئەو سەربازە چیت پێ دەڵێ؟

منیش وتم: گەورەم گلەییم لێدەکات، دەڵێ لەسەر تۆ سەرم سفر کراوە. ڕاستیش دەکات، ئەو هیچ گوناهێکی نەبوو، دەبوو سەری منت سفر کردبا نەک ئەو، چونکە من خەتابارم.

کە ئەمەم وت، ئامیر بە سەرتاشەکەی وت: هەر ئێستا سەری ئەویش سفرکە.

قاسم زەینەل لێم نزیک کەوتەوە ویستی سەرم سفر بکات، دەستیم گرت و پێموت: پیاونییە بتوانێ سەری من سفر بکات، بە قسەی ئامیر بکەیت و سەرم بتاشی دەتکوژم.

ئەویش ڕووی لە ئامیر کرد و پێی وت: گەورەم ناتوانم سەری ئەو سفر بکەم.

ئامیر سریەش ڕووی لە من کرد و پێی وتم: کەواتە تۆ سەری ئەو سفر بکە.

منیش وتم: باشە گەورەم.

ئەوەبوو، مەکینەی سەرتراشینەکەم لە قاسم زەینەل وەرگرت

و سەریم سفرکرد. ئینجا ئامیر رووی تێکردم وتی: مادام لە قەڵەمی سریە گوێڕایەڵی ئامیر فەسیڵ نابیت، حەزدەکەی بۆ کوێ بتگوازمەوە؟
وتم: بۆ دوورترین سەنگەر بمنێرە.
ڕووی لە ئامیر فەسیڵ کرد و پێی وت: هەر ئێستا عەلی ڕەش و ئەم سەربازە، هەردووکیان بۆ دوورترین سەنگەر بنێرە، جارێکی تریش لێرە نەیانبینمەوە؟
ئامیر فەسیڵ من و عەلی ڕەشی بە دوای خۆی دا و بەیەکەوە چووینە دەرەوە، ڕووی لە من کرد وتی: بەگوێی منت بکردبا باشتر نەبوو، نەوەک وەکو ئێستا ڕەوانەی دوورترین سەنگەر بکرێیت؟
وتم: نەخێر من خۆم ئەوەم دەویست، تەنها لەدەستی تۆ ڕزگارم بێت.
جا ئەوەبوو، من و عەلی ڕەشی ناردە سەنگەرێک لەسەر لووتکەی شاخێکی بەرز، پێیان دەوت (وادی الوطن).
هێسترێکی پیسکەیان دایە دەستم بۆ هێنانی نان و ئازووقە و ئاو بۆ سەنگەرەکەمان. پێیان وتم جڵەوەکەی بەدەستەوە بگرە و لەدوای خۆت ڕایکێشە، ئەو بەخۆی لەگەڵت دێت. هێسترەکە زۆر حەزی لە خواردنی گیابوو، کەڵە گیایەکی بچووکی لە شوێنێک ببینیبا، سەری خۆی بۆ شۆڕ دەکردەوە و تاکو نەیخواردبا نەدەڕۆیشت. لەبەر ئەوە نەمدەوێرا سواری سەر پشتی ببم، نەوەک لەکاتی چەمانەوەی فڕێمبداتە خوارەوە.
من و عەلی ڕەش هێسترەکەمان بەدوای خۆمان دا، بەرەو سەنگەرەکە بەڕێکەوتین. هەروەکو وتم، سەنگەرەکە لەسەر لووتکەی شاخێکی زۆر بڵند بوو، بۆیە تا گەیشتینە ئەوێ، زۆر ماند و بووین.

ڕۆژانــه بــه و هێسـتره کـەل و پـەل و ئـاو و ئازووقـەم لـه بـارەگای سـریه پێـی دەهێنـا بـۆ سـەنگەرەکەمان. زۆر جاریـش چـەک و تەقەمەنیمـان پێـی دەگواسـتەوە بـۆ سـەنگەرەکەمان.
لـەو سـەنگەرە زۆر بێـزار بـووم، وێـڕای ماندووبوونەکـەی، زۆربـەی شـەوان پێشـمەرگە بەسـەریان دادەدایـن و تەقەیـان لێدەکردیـن.
ئـەو پێشـمەرگانەی کـە شـەوان تەقەیـان لێدەکردیـن، بادینـی بـوون، بۆیـە کـە دەمانزانـی لـە شـێوەزاری سـۆرانی تێناگـەن، بـە زمانـی عەرەبـی دەنگمـان دەدان، پێمـان دەوتـن (ئێمـەش وەکـو ئێـوە کوردیـن، تەقەمـان لێمەکـەن).
ئیتــر ئەوەبــوو، تەقەیــان لــێ نەدەکردیــن و بەڕێــی خۆیــان دەڕۆیشــتن، ئێمــەش بەبــێ تــرس ئێشــکگرییەکەمان دەکــرد.
زۆربــەی شــەوان پێــش ئــەوەی بخەویــن، عەلــی ڕەش دەچــووە دەرەوە و بــە دەنگــی بــەرز بــە عەرەبییێکــی شــڕ هــاواری دەکــرد (پێشـمەرگە، پێشـمەرگە، تعـال اخـذ ثنیـن کـوردی وثـلاث عـرب و روح). سـەربازە عەرەبـەکان باوەڕیـان دەکـرد، وایـان دەزانـی پێشـمەرگە هاتۆتـە سـەرمان، بۆیـە پێـش ئـەوەی بخـەون، لەترسـان چـواردەورەی سـەنگەرەکەیان بەسـەردەکردەوە، ئینجـا دەخەوتـن.
نزیکـەی مانگێـک لـەو سـەنگەرە مامـەوە، ڕۆژێـک لەسـەر شـاخ هاتمـە خـوارەوە، چوومـە لای ئامیـر سـریە، چەکەکـەم ئـار بـی کـەی بـوو، لـە شـانی خـۆم کـردەوە و لەسـەر مێزەکـەی ئـەوم دانـا و پێمـوت: گـەورەم ئـەوە چەکەکـەم، هاوەنەکـەش لەنـا و سـەنگەر بەجێـم هێشـتووە، زۆر بێـزار بـووم ئەوەنـدەی ڕۆژانـە بـەو هێستره چەمووشـە شـتم پـێ بگوازنـەوە و شـەوانیش تاکـو بەیانـی ئێشـکگریم پێبکـەن. هیچـی تـر سـەربازی ناکـەم و دەڕۆمـەوە.
ئامیر وتی: بۆ کوێ دەڕۆی؟
وتم: بۆ ماڵەوە.

کە ئەمەم وت، ئامیر بە توورەییەوە وتی (لیش هذا امر لو تمر؟ الک جب).
منیش عەرەبیم باش نەدەزانی، وتم تۆش چەپ.
کە ئەوەم پێوت، سەری خۆی لەقاند وتی: ئەگەر زیاتر زماندرێژی بکەیت، دەتنێرمە سەنگەرەکانی ناو موعارەزەی ئێرانی (مەبەستی جەماعەتی عەبدولڕەحمان قاسملۆ بوو).
وتم: هەر شوێنێک بێت، لەو سەنگەرەی ئێستا باشترە.
ئیتر ئەوەبوو منی ناردە سەنگەرێک لە نزیک سەنگەرەکانی پارتی دیموکراتی ئێرانی لە ناوچەی کونە کۆتر و ئێڵزە.
گەڕامەوە سەنگەرەکەی خۆمان، لەسەر شاخی کورتەک، یاتاغەکانی خۆم لە هێسترەکە بار کرد و هاتمە خوارەوە بۆ ئەو سەنگەرەی کە بۆی گواسترابوومەوە. کە گەیشتمە جێ، چوومە ناو جەماعەتی حیزبی دیموکرات، ئەوان فرۆشگایەکی خنجیلانەیان لەناو ئۆردوگاکەی خۆیان هەبوو، هەندێک شیرینەمەنی و خواردنم کڕی و گەڕامەوە.
لە گەڕانەوەمدا، کە گەیشتمە نزیک سەنگەرەکە، ئامیر سریەکەمان نەقیب لەفتە لەپێش سەنگەرەکە وەستابوو، کە لێی نزیک بوومەوە، وتی: لەکوێ بوویت؟
منیش وتم: چوومە فرۆشگای حیزبی دیموکرات، هەندێک شتم بۆخۆم کڕی.
وتی: چۆن دەبێ بچیتە لای جەماعەتی موعارەزە؟
سەربازێکم لەگەڵ بوو، ناوی عوسمان بوو، ئەو لەسەر داوای من لەگەڵم هاتبووە فرۆشگا، هیچیشی نەکڕیبوو، وتی: گەورەم منیش لەگەڵی بووم.
ئامیر سریە وتی: ئەمجارە سزاتان نادەم، هەردووکتان بەڕاکردن بڕۆنە سەر ئەو گردە، دوایش هەر بە ڕاکردن وەرنە خوارەوە.

منیش وتم: گەورەم من ناتوانم بە ڕاکردن بێمە خوارەوە، نەوەک شوێنێکم بشکێت، دەکرێ بە خشخشۆک بێمە خوارەوە؟
بە پێکەنینەوە وتی: ئا دەتوانی.
من و عوسمان بە ڕاکردن چووینە سەر گردەکە و دواییش بە خشخشۆکێ هاتینە خوارەوە و چووینە سەنگەرەکەمان.
ئەو سەنگەرە بە ئێمەوە نۆ کەسی تیابوو. بی کەی سێیکمان لەسەر سەنگەرەکە دانابوو، لەگەڵ هاوەنێکی شێست ملیمی، هەروەها ئاربیی کەی و قازیفە و چەند کلاشینکۆفێکیشمان هەبوو. ئامیری ڕەبیەکەمان نائیب زابت عەبد جبوری خەڵکی شاری موسڵ بوو.
لە سەنگەرەکەمان، تەلەفۆنێکمان لابوو، بە هندر ئیشی دەکرد. ڕۆژێک تەلەفۆن کرا، منیش هەڵمگرت، ئەو کەسەی تەلەفۆنی دەکرد، وتی (سیانزە...سیانزە) منیش وەڵامم دایەوە وتم (بەڵێ) وتی (ئوتومبێلێک بە سەرپێچی هاتووە، لە سەنگەرەکەی ئێوە نزیک بۆتەوە، بڕۆن بیگرن).
منیش کلاشینکۆفەکەم بەشانم وەکرد و بە ڕاکردن لەسەر شاخەکە چوومە خوارەوە. جێبێکم بینی ڕاوەستابوو، پیاوێکی لێ دابەزی، دوو کەسی لەگەڵدا بوو، جلی کوردییان لەبەر بوو، نەمزانی ئەوان جاشن.
وامزانی ئەوکەسەی لەگەڵ ئەوانە، کوردە، بۆیە بە زمانی کوردی پێموت: زەحمەت نەبێ بگەڕێوە، ئێرە ناوچەیەکی سەربازییە، هاتوچۆکردن تیایدا قەدەغەیە.
ئەویش وتی: کوڕی خۆم من ئەفسەری هەواڵگریم، بە کار هاتووین، دەورییەیەکمان لێرە هەیە.
منیش وتم: ڕێز لە قسەکەم بگرە، پێت دەڵێم بگەڕێوە ئەو شوێنەی کە لێی هاتووی دەنا خۆم دەزانم چیتان لێدەکەم.

ئەویش بە زمانی عەرەبی هەمان قسەی پێشووی دووبارە کردەوە.
منیش هەر وامزانی کوردە و بە ئەنقەست خۆی کردۆتە عەرەب و دەیەوێ فریوم بدات.
کلاشینکۆفەکەم سوارکرد و لەکەم ئاراستەی ئەو کرد و پێم وت: ئەگەر هەر ئێستا ئێرە بەجێ نەهێڵیت و نەگەڕێیتەوە، یەک مەخزەن فیشەکت لێ بەتاڵ دەکەم.
کە وام وت، ناسنامەکەی لە گیرفانی دەرهێنا وتی: من عەمیدی هەواڵگریم.
منیش وتم: شتی وا ناخوات دەبێ بگەڕێیتە دواوە.
پاش ئەوەی ناسنامەکەیم بینی، لەبیری خۆمدا وتم (من بەهەڵەدا چووبووم کە وامزانی ئەو دوو کوردەی لەگەڵیدان، جاشن، دیارە ئەوانە پێشمەرگەن و بەدیل گیراون)، ڕووم تێکردن و پێم وتن: ئەگەر ئێوە پێشمەرگەن و گیراون، دەتوانن خۆتان ڕزگار بکەن و ڕابکەن، تەقە لە ئێوە ناکەم.
که وام وت، سەری خۆیان شۆڕ کرد و هیچ قسەیەکیان نەکرد.
عەمیدی هەواڵگرییەکە، کە زانی ڕێگایان پێنادەم، بەتووڕەیی پێی وتم، ئێمە وا دەگەڕێینە دواوە، بەڵام خۆم دەزانم چیت بەسەردێنم، دەتسووتێنم.
منیش وتم: هەر چیت لەدەست دێت بیکە، من فەرمانم پێکراوە کە نەهێڵم لێرەوە تێپەڕن.
سواری جێبەکەیان بوون و گەڕانە دواوە. دوای ئەوان، منیش گەڕامەوە شوێنی خۆم.
دوای تۆزێک، جارێکی تر تەلەفۆنیان بۆ کردینەوە، کە هەڵمگرت، ئامیر فەوج لەسەر خەت بوو پێی وتم: ئەو کەسە ئەفسەری هەواڵگری بووە، بۆچی ڕێگات پێی نەداوە بڕوات؟

بــە توورەیــی وتــی: تــۆ کارێکــی زۆر خراپــت کــردووە، ئــەو بــە کارێکــی زۆر گرینــگ هاتبــووە ناوچەکــە، تــۆ کارەکــەت لێیــان تێـک داوە. ئێســتا شــەوە و کاتەکــەی درەنگــە، بەیانــی وەرە خــوارەوە بــۆلام لــە بــارەگای فــەوج، قســەت لەگــەڵ دەکــەم.
ئیتــر ئەوەبــوو، بەیانــی چوومــە بــارەگای فــەوج، بــۆ لای ئامیــر فــەوج عەقیــد ســەلیم تاریــق. خــۆم پێشکەشــی کــرد وتــم: مــن ســەربازم لــە ســریەی پێنــج.
وتی: تۆ خەڵکی کوێی؟
وتم: من کوردم، خەڵکی شاری هەولێرم.
وتی: بڵێ موخەڕیبم؟!
وتم: بۆچی وا بڵێم؟
وتــی: ئــەی بۆچــی نەتهێشــت ئــەو ئەفســەرە بەســەر شــاخەکە بکەوێــت و تێپەڕێــت، لەکاتێــکا ناســنامەی خــۆی پیشــانت داوە و پێــی وتــووی عەمیــدی هەواڵگریــم؟!
منیــش وتــم: مــن لەخۆمــەوە نەهاتوومەتــە خــوارەوە، لــە بــارەگای ســریە تەلەفۆنــم بۆکــرا، پێیــان وتــم (ئۆتومبێلێــک لــە خوارەوەیــە، بــڕۆ ڕێــگای لێبگــرە و مەهێڵــە تێپەڕێــت). مــن بــە ئــارەزووی خــۆم ئــەوەم نەکــردووە بەڵکــو فەرمانــی ئێــوەم جێبەجێکــردووە. لەســەر ئێوە خۆشــی لە مــن توورەکرد و وتــی: وا دەگەڕێمەوە شــوێنی خــۆم، خــۆت و ئامیــر ســریە و ئامیــر فەوجەکــەت بەیەکــەوە دەســووتێنم.
منیــش پێمــوت (مــن بســووتێنیت قەینــاکات، بــەڵام ئامیــر ســریە و ئامیــر فەوجەکــەم چــۆن بــە کەســێکی وەکــو تــۆ دەســووتێ؟!).
کــە ئەمــەم وت، هێمــن بــۆوە و بــە پێکەنینــەوە وتــی: (واتــە وای پێوتــی؟ خــوا ئــاگادارت بێــت، تــۆ پیاوێکــی مەردیــت، بگەڕێــوە ســەنگەرەکەی خــۆت). خــوا بەزەیــی پێــم هاتــەوە، ئەمجــارەش لــە ســزا ڕزگارم بــوو.

سوپای عێراق ماوەی چەند مانگێک بوو کوێتی گرتبوو، بارودۆخمان زۆر خراپ بوو، وەکو جاران بایەخیان پێمان نەدەدا، خواردنیشمان زۆر کەم ببۆوە، هەندێک جار ئەو بڕە ئازووقەیەی دەدرایە ئیعاشەی سریەکەمان بەشی نەدەکردین و بەبێ خواردن دەماینەوە.

ڕۆژێک لەگەڵ چەند سەربازێکی سەنگەرەکەمان دابەزین، چووینە دارستانەکەی ناوچەی کونەکۆتر. من چەکی ئار بی کەیم پێ بوو، لە پەنای دارەکان تارماییێکی گەورەم بینی، چەکەکەم سوارکرد و فیشەکێکم تێی گرت، دوو کەس لە پەنای دارەکە هاتنە دەرەوە و دەستی خۆیان بەرز کردەوە، وتیان ئێمە دیلی تۆین.

منیش وتم: دیلی چی، من تارماییێکم لە پەنای ئەو دارانە بینی، وامزانی دڕندەن بۆیە تەقەم لێکردن، نەمزانی ئێوەن، دەنا چۆن تەقەم لێدەکردن!

وتیان: شتی وا نییە، دەبێ لەگەڵ خۆت بمانبەیت و ڕادەستی ئامری خۆتمان بکەیت.

منیش وتم: ئێوە پێشمەرگەن، بڕۆن، تووشی بەڵایەکم مەکەن.

ئەوان هەر سووربوون لەسەر ئەوەی بیانگرم و ڕادەستیان بکەمەوە. منیش دابوومە لاملێ و بەگوێم نەکردن.

کە زانییان لەگەڵ خۆم نایانبەم، وتیان (کەواتە بارەگای سریەمان پیشاندە).

منیش بە دەست ئیشارەتم بۆ کردن، وتم ئەوە بارەگای سریەکەمانە.

ئەوان بەرەو بارەگای سریەکەمان ڕۆیشتن، منیش زۆر ترسام، لە دڵی خۆمدا دەموت (ئەگەر ئەو پێشمەرگانە لەسەر من شتێکیان بەسەربێت و بگیرێن، منیش تێدەچم).

دوای خۆرئاوابـوون، لەگـەڵ سـەربازەکان گەڕامـەوە بـارەگای سـریە، لـە کافتریـای سـریە دانیشـتبووین، هەندێـک سـەربازی بەڕەگـەز عەرەبـی فەسیڵەکەشـمان لـەوێ بـوون. ئاوڕێکـم بـۆ پشـتەوەی خـۆم دایـەوە، ئـەو دوو پیـاوەی کـە لەنـاو دارسـتانەکە تەقـەم لێکردن، لەپشت ئێمە دانیشتبوون. کە منیـان بینـی تەماشـایەکی یەکترییـان کـرد و پێکەنیـن.

یەکێیـان وتـی: کاتێـک لەنـاو دارسـتانەکە تەقـەت لێکردیـن، واتزانـی ئێمـە پێشـمەرگەین واترسـایت، نەتزانـی ئێمـە کارمەنـدی دەزگای هەواڵگریـی سـەربازین؟

منیـش لەترسـان حاشـام لێکـرد وتـم: مـن ئێـوەم نەبینیـوە و ناشـتان ناسـم.

وتـی: پێویسـت نـاکات حاشـای لێبکەیـت، ئـەوە تـۆ بوویـت، چەکێکـی ئـار بـی کەیـت پـێ بـوو، نیشـانەت لـە کۆتـری کێـوی دەگـرت.

منیـش هـەر ئینـکارم کـرد، وتـم: لەوانەیـە کەسـێکی ترتـان بینیبێـت شـێوەی لـە مـن چووبێـت. ئەگـەر مـن بوومـا هەردوکتانـم دەگـرت و ڕادەسـتی سـریەم دەکـردن.

پیـاوەکان کـە زانییـان لەترسـان ئینـکار دەکـەم، تەماشـایەکی یەکترییـان کـرد وتیـان: لەوانەیـە ئێمـە هەڵەبیـن.

باش بوو لەو بەڵایەش ڕزگارم بوو.

ئەفسـەرێکمان هەبـوو، دوو ئەسـتێرەی لەسـەر شـان بـوو، نـاوی عەبـد عـۆن بـوو، زۆر حـەزی لـە سـزادانی ئێمـە بـوو، لەخـوای دەویسـت بچووکتریـن سـەرپێچیمان لـێ ببینـێ تاکـو سـزامان بـدات.

ڕۆژێـک دەگەڕامـەوە بـۆ بـارەگای سـریەکەمان، چەکـی ئـار بـی کـەم پێبـوو، لەگـەڵ پێنـج مەخزەنـی فیشـەک. منـی ڕاگـرت و

تەماشـایەکی مەخزەنـی فیشـەکەکانی کـرد، هـەر مەخزەنێـک سـی و نـۆ فیشـەکی تێدابـوو. وتـی: بۆچـی پێنـج فیشـەکت ناتـەواوە؟
وتـم: گـەورەم ئـەو پێنـج فیشـەکەم لەنـاو جوعبـەی مەخزەنـەکان دانـاوە. وتـی: بۆچـی واتکـردووە؟
وتـم: بـەو شـێوەیە باشـترە، لەکاتـی تەقەکـردن فیشـەکەکان گیرنابـن.
کـە ئەمـەم وت، وتـی: ئافەریـن، تـۆ زۆر ئـازا و بوێـر دیاریـت، سـواری سـەیارەکە ببـە بـا مـن بتگەیەنمـە جـێ.
منیش وتم: گەورەم حەزدەکەم بە پێ برۆم.
باش بوو لەدەست مولازم عەبد عۆنیش ڕزگارم بوو.
ماوەیەکـی زۆر لـە ناوچـەی ئێڵـزماینـەوە، شـەوان لەگـەڵ ئامیـر فەسـیلەکەمان بـۆ کەمیـن دەردەچوویـن. جموجوولـی پێشـمەرگەش لـەو ماوەیـەدا زیـادی کردبـوو، بۆیـە دەترسـاین نـەوەک شـەوێک لەنـاکاو بەسـەرمان دابـدەن.
ڕۆژێـک بـە ئیجـازە دابەزیـم و چوومـە قـەزای ڕانیـە، بـۆ ماڵـی خوشـکم. زاواکەمـان ڕەفیـق حیزبـی بـوو لـە فرقـەی حیزبـی بەعـس. باسـی شـوێنەکەی خۆمـم بـۆی کـرد، داوام لێیکـرد، واسـیدەیەکم بـۆ بـکات، لـە سـریە ئاگایـان لێـم بێـت. منـی لەگـەڵ خـۆی بـردە بـارەگای حیـزب، منـی ناسـاند بـە کەسـێک نـاوی فەتـاح بـوو، خەڵکـی شـاری ڕومـادی بـوو، لەگـەڵ زاواکەمـان بەیەکـەوە لـەو بارەگایـە ڕەفیـق حیزبـی بـوون. پێـی وت (ئەگـەر ئەفسـەرێک لـە وەحدەکەمـان دەناسـێت، شـتێکم بـۆ بـکات).
ئەویش وتـی: خۆشبەختانە ئامیـر فەوجەکەتـان دەناسـم، خەڵکـی یـەک ناوچەیـن.
ئیتـر ئەوەبـوو کاغەزێکـی بـۆ ئامیـر فەوجەکەمـان دامـێ و وتـی: هیـچ خەمـت نەبـێ، هەرکاتێـک ئامیـر فەوجەکەتـان ئـەو کاغـەزەی

منی پێگەیشت، حیسابی کوڕی منت بۆ دەکات و ئاگای لێت دەبێت.
دوای ئەوەی ماوەی ئیجازەکەم تەواو بوو، لە گەڕانەوەم، چوومە بارەگای فەوج و کاغەزەکەم بە موراسیلی ئامیر بۆی ناردە ژوورەوە. دوای تۆزێک بانگی کردم و حەفتەیەک ئیجازەی بۆ نووسیم و پێی وتم (هەرکاتێک ویستت دابەزیت، وەرە لای من ئیجازەت دەدەمێ).
بەم شێوەیە، پارووم کەوتە ناو ڕۆن و لە ئەفسەرەکانی سریەکەمان بێ منەت بووم، هەرجارێک بێزار بوومایە دەچوومە لای ئامیر فەوج و داوای ئیجازەم لێی دەکرد.
جارێک من و سەربازێک ناوی هادی بوو، لەناو سەنگەرەکەی خۆمان بووین، گوێمان لە دەنگی هەندێک گوللە بوو، بە ئاراستەی سەنگەرەکەی ئێمە دەهاتن. هادیش بە منی وت: تۆ چەکی ئار بی کەیت پێیە، تەقە بکە، پێدەچێ ئەوانە پێشمەرگەبن، دەیانەوێ بەسەرمان دابدەن.
منیش بەقسەی ئەوم نەکرد و هیچ تەقەم نەکرد. هادی بە کلاشینکۆفەکەی خۆی سێ فیشەکی ئاراستەی شوێنی تەقەکردنەکە کرد. هەر ئەوکات، سەربازێکمان لە دەرەوەی سەنگەرەکە بوو، بە ڕاکردن هاتە لام وتی: تەقە بکە موخەڕیب بەسەریان داداوین؟
منیش بەقسەی ئەویشم نەکرد، هیچ تەقەم نەکرد. ئەویش تەلەفۆنی لەگەڵ ئامیر فەسیڵ کردو شکایەتی لێکردم. ئامیر فەسیڵ هەر بە تەلەفۆنەکە قسەی لەگەڵک ردم وتی: ئێستا کاتەکەی درەنگە، بەڵام بەیانی زوو وەرە بارەگای سریە، لێپرسینەوەت لەگەڵ دەکەم.
ئیتر ئەوەبوو، بەیانی لەگەڵ زیلی قسعە ڕۆیشتم بۆ بارەگای

سـریەکەمان، لـە فەوجـی شـەش لـە دۆڵـی شـەهیدان، لـە نزیـک سەنگەسـەر. مـولازم سـتارم لـەوێ بینـی، وتـی بۆچـی هاتـووی؟
وتـم: ئامیـر فەسـیڵ بانگـی کـردووم نازانـم نیـازی چییـە.
ئێمـە لـەو قسـانەدا بوویـن، ئامیـر فەسـیڵ منـی بینـی، وتـی:
ئـەوە بۆچـی یاتاغـت لەگـەڵ خـۆت نەهێنـاوە، تـۆ دوێنـێ تەقـەت لـە موخەڕیبـەکان نەکـردووە، دەبـێ سـزا بدرێیـت.
منیـش وتـم: کـەس ناتوانـێ مـن سـزا بـدات. وتـی: بـڕۆ لای ئامیـر سـریە، ئەوجـا دەیبینـی چـۆن سـزات دەدات.
منیـش چوومـە لای ئامیـر سـریە سـڵاوم کـرد و خـۆم پێشکەشکرد.
هەرچەنـد عەرەبیەکـەم زۆر بـاش نەبـوو، بـەڵام کـە دیقەتـم دا نیـازی خـراپ بـوو، دەیویسـت سـزام بـدات. وتـم: گـەورەم بـاش عەرەبـی نازانـم.
وتـی: چـۆن شـتی وا دەبـێ. تـۆ خەریجیـت، ئـەی چـۆن بڕوانامـەت وەرگرتووە؟
منیـش وتـم: تۆزێکـی لێدەزانـم بـەڵام لەوانەیـە قسـەکانم تێکـەڵ و پێکـەڵ بکـەم. داوا دەکـەم کەسـێکم بـۆ بانـگ بکەیـت قسـەکانم بـۆ وەربگێڕێـت.
کە ئەمەم وت، وتی: سوێند دەخۆم تۆ موخەڕیبیت.
منیـش وتـم: ئەگـەر مـن موخەڕیـب بـام، سـەدام حوسـێن منـی نەدەنـاردە ئێـرە خزمـەت بکـەم.
کـە ئەمـەم وت، کەمێـک بێدەنـگ بـوو، دوایـی وتـی: ئـەی بۆچـی تەقـەت نەکـرد؟
وتـم: گـەورەم مـن گوێـم لـە دەنگـی هیـچ تەقەیـەک نەبـووە، ئـەو سـەربازەش کـە پێـی وتـم موخەڕیـب بەسـەریان داداویـن تەقـە بکـە، درۆزنـە، بـە درۆزنـی سـریەی پێنـج نـاوی دەرکـردووە.
وتی: ئەگەر وانەبێت؟

وتم: له هەر سەربازێکی سریەکەمان دەپرسیت بپرسە، ئەگەر وانەبوو، ئامادەم بۆ هەموو سزایەک.
کە ئەمەم وت، ڕووی لە عەریف فەسیڵەکەمان کرد، پێی وت: ڕاستە ئەو سەربازە بە درۆزنی سریە ناوی دەرکردووە؟
ئەویش وتی: ئەوە ڕاستە، ئەو درۆزنێکی بێ وێنەیە.
کە ئامیر سریە ئەمەی گوێ لێبوو، وتی: گریمان ئەو کەسێکی درۆزنە، بەڵام بۆچی تۆ تەقەت نەکرد؟
منیش وتم: لەبەر ئەوەی من گوێم لە هیچ تەقەیەک نەبوو، بەقسەی ئەویشم نەکرد، چونکە کەسێکی درۆزنە. ئەمەم وت، ئینجا بە پێکەنینەوە پێموت، گەورەم من خەڵکی شاری هەولێرم، لەگەڵ تۆ خزمین، کەچی تۆ دەتەوێ سزام بدەیت؟
ئەویش وتی: بۆ خاتری خوا، ئێمە لەکوێ و هەولێر لە کوێ!
منیش وتم: بەخوا خزمین، بەڵام دیارە تۆ ناتەوێ ئەوە بزانیت.
وتی: بۆم باسکە، بزانم چۆن تۆ خزمی منی.
وتم: ئێمە لەگەڵ ڕەفیق فەتاح دلێمی زۆر نزیکین.
وتی: مەبەستت ڕەفیق فەتاح ڕەزووقییە؟
وتم: بەڵێ.
وتی: ئەو ئێستا لەکوێیە؟
وتم: لەگەڵ زاواکەمان ئەندامی فرقەی حیزبی بەعسە لە شاری ڕانیە.
کە ئەمەی گوێ لێبوو، هەستایە سەرپێ، باوەشی پێداکردم و ماچی کردم. نامەیەکی بۆی نووسی و دایە دەستم، وتی: حەوت ڕۆژ ئیجازەت دەدەمێ، هەر ئێستا بڕۆ لای، ئەم نامەیەی منی بۆببە.
کە ئامیر فەسیڵ ئەمەی گوێ لێبوو، ڕووی تێکردم و بە

پێکەنینـەوە وتـی: چیـت دەوێ لەجیاتـی سـزابدرێیت، وا ئیجـازەی حەفتەیەکیشـت وەرگـرت.
ئیتـر ئەوەبـوو هاتمـەوە ڕانیـە، نامەکـەم گەیانـدە دەسـت ڕەفیـق فەتـاح. ئەویـش بـە دەوری خـۆی نامەیەکـی بـۆ لـە قائیـد فرقـەی بیسـت و چـوار وەرگـرت بـۆ ئامیـر فەوجەکەمـان، وتـی: ئـەم نامەیـەش بـۆ ئامیـر فەوجەکەتـان عەقیـد عەبـد عـۆن ببـە، بـا زیاتـر ئـاگادارت بێـت.
کـە نامەکـەم بـۆ ئامیـر فـەوج بـرد، سـەری سـوڕما، وتـی: تـۆ چـۆن قائیـد فرقـە دەناسـیت؟
وتم: هاوڕێی زاواکەمە، زۆربەی ڕۆژان بەیەکەوەن.
زۆر ڕێـزی لێگرتـم وتـی: جارێکـی تریـش پێـم وتبـووی، هەرکاتێـک ئیجـازەت پێویسـت بـوو، مەچـۆ بـۆلای کـەس، ڕاسـتەوخۆ وەرە لای مـن.
هـەر ئـەو کاتـە نموزەجێکـی ئیجـازەی لـە چەکمەجەکـەی خـۆی دەرهێنـاو یـەک حەفتـە ئیجـازەی دامـێ و پێـی وتـم: ئـاگاداری سـریەکەتان بکـەوە، ئینجـا دابـەزە و سـڵاوی منیـش بگەیەنـە ڕەفیـق فەتـاح و قائیـد فرقـە و زاواکەتـان.
کـە گەڕامـەوە سـریەکەمان، چوومـە لای ئامیـر سـریە و ئیجازەکـەم پیشـان دا، وتـم قائیـد فرقـە حـەوت ڕۆژ ئیجـازەی پێـداوم.
ئامیـر سریەکەمان کـە چاوی بـە ئیجاکـەم کـەوت، بەسەرسـوڕمانەوە وتـی: تـۆ چـۆن بەسـەر منـدا پـاز دەدەیـت و دەچیتـە لای قائیـد فرقـە؟
منیـش وتـم: جـا تـۆ چیـت، ئـەوە تەلەفۆنـت لەبەردەمدایـە، دەتوانـی تەلەفۆنـی بـۆ بکەیـت و پێـی بڵێیـت بۆچـی ئیجـازەت داوەتـێ.
بەهەرحـاڵ، چوومـە ڕانیـە، شـەوێک لـە ماڵـی خوشـکم مامـەوە،

دوایـی گەڕامـەوە شـاری هەولێـرو چوومـە ماڵـەوە. دوای تەواوبونـی ئیجازەکەشـم گەڕامـەوە سـەریەکەمان و چوومـەوە سـەنگەرەکەی خـۆم. زۆر دەترسـام، نـەوەک ئامیـر سـریە ڕقـم لـێ هەڵبگرێـت و کێشـەم بـۆ دروسـتکات.

ئێوارەیـەک تەلەفۆنـی بۆکـردم، وتـی: هـەر ئێسـتا دابـەزە و وەرە لای مـن.

منیـش وتـم: گـەورەم کاتەکـەی درەنگـە، زۆری نەمـاوە ڕۆژ ئاوابێـت، بەیانـی دێمـە لات.

وتی: من پێت دەڵێم دابەزە، یانی دابەزە.

وتـم: گـەورەم تاریکیـم بەسـەردا دێـت، ڕێگایەکەشـمان بـە مەترسـییە.

وتـی: ئێسـتا سـەربازێکت لەگـەڵ هێسـترێک بـۆ دەنێـرم، لەگـەڵ ئـەو وەرە.

وتم: ئەگەر وابێت باشە.

ئیتـر ئەوەبـوو، سـەربازێکی لەگـەڵ هێسـترێک بـۆ نـاردم، منیـش لەگـەڵ ئـەو بـە سـواری هێسـترەکە چوومـە لای.

ئامیـر سـریە خـۆی لـێ تـووڕە کـردم وتـی: ئـەوە بۆچـی موناقەشـەم لەگـەڵ دەکەیـت، کـە پێـت دەڵێـم دابـەزە دەبـێ تـۆ دابەزیـت و قسـەی زیـاد نەکەیـت. ئەمشـەو لـە بـارەگای سـریە پاسـەوانی بکـە و مەگەڕێـوە سـەنگەرەکەی خـۆت.

منیـش لـە دڵـی خۆمـدا وتـم (دیـارە ئـەو سـەگبابە دەیـەوێ تۆڵـەم لێبکاتـەوە و سـزام بـدات، بۆیـە منـی هێناوەتـە خـوارەوە).

بـەڵام وا دەرنەچـوو، بـۆ بەرژەوەندیـی مـن ئـەوەی کردبـوو. چونکـە هـەر ئـەو شـەوە پێشـمەرگە بەسـەر سـەنگەرەکەی ئێمەیـان دادابـوو. هەرچەنـد کـەس نەکوژرابـوو، بـەڵام زیانێکـی زۆر بـەر سـەنگەرەکەمان کەوتبـوو.

بەم شێوەیە، ئەو نامەیەی کە بۆ قائید فرقەم هێنابوو، زۆر سوودم لێی بینی. ئامیر سریەش بووە هاوڕێم و هەتا لەو سریەیە مامەوە، هیچ نەیدەناردمە کەمین و زۆر ئاگای لێم دەبوو.
دوای ماوەیەک، ئامیر سریەکەمان گوێزرایەوە بۆ وەحدەیەکی تر و ئەفسەرێکی تر هاتە شوێنی، خەڵکی دیوانیە بوو، ئەفسەرێکی کوردیش لەگەڵ ئەو هات بووە جێگری.
ئەو ڕۆژەی لە سریەکەمان دەستبەکار بوو، تەلەفۆنی بۆکردم، وتی: دابەزە، وەرە لای من.
منیش کە هاتمە خوارەوە و چوومە لای، مولازم عەلی و حەوت سەربازی سریەکەمانی لەلا بوو. ڕووی تێکرم وتی: ئەمشەو ئێوە بە کەمین دەردەچن. هەواڵمان لە هەواڵگری سەربازی بۆ هاتووە، ئەمشەو مەفرەزەیەکی پێشمەرگە لەگەڵ قاچاغچییەکان دادەبەزن. بەسەریان دابدەن، لێمەگەڕێن کەسیان دەربازبن.
منیش وتم: گەورەم ئەگەر ئەوان دابەزن، بەکۆمەڵ دادەبەزن، بەم ژمارە کەمە، ئێمە دەرەقەتیان نایەین، باشترە ڕووبەڕوویان نەبینەوە و ماوەیان بدەین بڕۆن.
وتی: شتی وا چۆن دەبێ، ئێوە دابەشبن بۆ دوو گرووپ، کە ئەوانتان بینی، دەنگیان بدەن ئەگەر خۆیان بەدەستەوە نەدا، تەقەیان لێبکەن و تەفروتوونایان بکەن.
ئیتر ئەوەبوو، ئێمە چووینە نزیک سەنگەرەکانی خۆمان و دابەش بووین بۆ دوو گرووپ. درەنگی شەو گوێمان لە تەپەی پێی قاچاخچییەکان بوو، ئێمە چەکەکانمان سوار کردبوو، لە حاڵەتی ئامادەباشیدا بووین. دوای تۆزێک، دوو قاچاخچی لەگەڵ دوو هێستر لە دوورەوە بەدیارکەوتن، هێشتان ئەو ئەفسەرەی ئامیری دەوریەکەمان بوو، فەرمانی تەقەکردنی پێنەکردبووین، بەڵام کاتێک

قاچاخچییەکان لێمان نزیک بوونەوە، سەربازێکی ئێزدیمان لەگەڵ بوو، ناوی خودێدە بوو، چەکێکی سەمینۆفی لەدەست بوو، ڕووی چەکەکەی لە یەکێک لەو قاچاخچیانە کرد، سێ گوللەی لێدا و خستییە خوارەوە.

قاچاخچییەکەی تریش لەترسان ورەی بەردا، نەیتوانی ڕابکات، ئەویشی گرت. هێسترەکانیش لەگەڵ دەنگی تەقەکان ڕەوینەوە و بۆ دواوە گەڕانەوە.

کە ڕۆژهەڵات، گەڕاینەوە بارەگای سریەکەمان و قاچاخچییەکەشمان بەپێش خۆمان دا و بردمانە لای ئامیری سریە.

قاچاخچییەکە کەسێکی ئێرانی بوو، ئەوی بەدیل گرت و بە ئێمەشی وت: هەر ئێستا بگەڕێنەوە ئەو شوێنەی کە قاچاخچییەکەی ترتان لێی کوشتووە، لە شوێنی ڕووداوەکە چاڵێک هەڵکەنن و تەرمی ئەو قاچاخچییەی لەناو بنێژن و شوێنەکەشی بەنیشان بکەن.

ئێمەش چووینە شوێنی ڕووداوەکە، لە وادی ئەلمەوت، ئاوی زارگەلی بەوێدا دەهات، خاکەکەی زۆر نەرم بوو. لەوێ گۆڕمان بۆی لێداو لەناوی نێژتمان و دواییش بە نیشانمانکرد و گەڕاینەوە شوێنی خۆمان.

ئامیری سریە دەستخۆشی لێکردین و پرسی کە کێ قاچاخچییەکەی کوشتووە؟

خودێدە وتی: گەورەم من کوشتوومە.

ئامیر سریە دەستی خودێدەی گوشی و پێی وت: ئافەرین.

دوایی ڕووی لەمن کردو پێی وتم: هەندێک سەربازی مغاویری لیوای هەشتاو یەک لەگەڵ چەند کەسێک بە میوانی هاتوونەتە سریەکەمان، ئەمشەو لەگەڵیان بڕۆ بۆ سەر شاخ، لە سەرەوەی سەنگەرەکانی ئێوە، شوێنێک هەیە، ئەوان هاتوون ئەوێ بەسەردەکەنەوە.

ئەوەبوو، منیش لەگەڵیان ڕۆیشتم، کە گەیشتینە جێ، ئەو ئەفسەرەی لەگەڵیان بوو، ڕیزی کردن و ناوی خوێندنەوە، یەکێک لەو سەربازانە دیار نەبوو.
گەڕاینە خوارەوە، ئەفسەرەکە تەلەفۆنی لەگەڵ بارەگای فیرقە کرد، پێی وتن کە یەکێک لە سەربازەکانی دیار نەماوە، لەوانەیە ڕایکردبێت.
پێیانوت (دەبێ بگەڕێیتەوە شوێنی خۆتان و بەوردی ئەو شوێنە بپشکنن، لەوانەیە شتێکی بەسەرهاتبێت).
کە گەڕاینەوە شوێنی خۆمان، کاتێک لەناو دارستانەکە بەلایت بەدوای ئەو سەربازە دەگەڕاین، بینیمان کوژراوە و ناو زگیشی دەرهاتووە و چەکەکەشی شکاوە و لەلای تەرمەکەی فڕێدراوە.
ئەفسەرەکە وتی: دیارە پێشمەرگە ئەویان کوشتووە؟
منیش وتم: نەخێر گەورەم، پێشمەرگە کاری وا دڕندانە ناکات، ئێرە ورچێکی زۆری لێیە، دیارە ورچ بە چەپەڵۆکەکانی ورگی دڕاندووە و چەکەکەشی شکاندووە.
تاکو گەیشتینە خوارەوە، دوو سەربازی تریشمان لێ ون بوو.
کە گەیشتینەوە بارەگای سریە، ئەفسەرەکە ئاگاداری فیرقەی کردەوە بۆ ڕووداوەکە. فیرقەش هەر بەو شەوە هێزێکی زۆری هێنا، ئێمەش لەگەڵیان چووین بۆ شوێنی ڕووداوەکە، کۆپتەریش لەگەڵمان هەستا.
ئەو هێزەی لەگەڵمان هاتن، زۆر بە وردی ئەو ناوچەیان پشکنی. ئەشکەوتێکمان دۆزییەوە، بڕێکی زۆر کارتۆنی جگەرەی لێبوو، وا پێدەچوو، کە شوێنی قاچاخچییەکان بێت. بەڵام کەسمان لەوێ نەبینی، ئەو دوو سەربازەش کە ون ببوبوون، نەماندۆزینەوە و بێ سەروشوێن مانەوە.
کە گەڕاینەوە، ئامیری سریە، هەندێک پاکەتە جگەرەی دایە

هەریەکێک لە ئێمە و کارتۆنەکانی تریشی بۆخۆی گێڕایەوە.
دوای ماوەیەک، سریەکەی ئێمەیان گواستەوە بۆ کوێت. من و هەشت سەربازی تریشیان لەگەڵ ئەفسەرێک ناردە گردی کۆزەر لە نزیک چۆمان. کە گەیشتینە ئەوێ، ئەفسەرەکە پێی وتین: دەبێ لێرە سەنگەرێک دروستبکەین، لەمەودوا ئەرکمان لێرە دەبێت.
هەر بەو شەوە دوو خێمەمان هەڵدا، یەکێک بۆ ئەو ئەفسەرەی لەگەڵمان بوو، ئەوی تریش بۆ ئێمە. هەروەها سەنگەرێکیشمان بە بەردی شاخ دروستکرد و سەریشیمان بە چینکۆ گرت.
ئەو شوێنەی ئێمەی لێبووین، جگە لە سەنگەرەکەی ئێمە، هیچ سەنگەرێکی تری سەربازی لێ نەبوو.
زۆر ماندووبووین، لەسەرمانیش وەکو کێچ دەلەرزین. زۆریش خەومان دەهات، بۆیە، ئەو شەوە واجبمان پێنەگیرا، چووینە ناو خێمەکە و تاکو بەیانی لێی خەوتین.
بەیانی کە لەخەو هەستاینەوە، بینیمان ئەو ناوچەیە سپی هەڵگەڕاوە بە بەفر. بەفرێکی زۆری تێکردبوو، زۆر سەرما بوو، ئاگرێکمان کردەوە و خۆمان لەدیار گەرم کردەوە.
یەکێکمان لەگەڵ بوو، ناوی عوسمان بوو، زۆر ئازا بوو، خەڵکی حاجیاوە بوو، تەماشایەکی دەوروپشتی سەنگەرەکەی کرد، وتی: لەگەڵ من وەرە، تەنەکەیەکی بەتاڵ لەگەڵ خۆت بێنە، هەندێک ئەڵغام لەپشت سەنگەرەکەمان چاندراون، دەریان دەهێنین، بەمەش ڕێگایەکەمان بۆسەر شەقامی گشتی کورت دەبێتەوە.
بەیەکەوە چووین، من تەنەکەکەم بەدەستەوە گرتبوو، ئەویش بە قامەی چەکەکەی، ناوە ناوە ئەڵغامێکی لە زەوی دەردەهێنا و دەیخستە ناو تەنەکەکەوە. بەو شێوەیە، تەنەکەیەک ئەڵغاممان لە زەوی هەڵگرتەوە.

کـە گەڕاینـــەوە لای ســـەنگەرەکەمان، تەنەکەکـــەم بـــە تونـــدی بـــە زەویـدا دا. ئامیـری ڕەبیەکەمـان یـەک خەتـی هەبـوو، کـە چـاوی بـە ئەڵغامـەکان کـەوت، لـە ترسـان دەرپـەڕی وتـی: ئـەوە تـۆ چـی دەکەیـت، ئەگـەر ئـەو ئەڵغامانـە بتەقنـەوە، دەمانکوژێـت.
منیـش وتـم: بـا بمانکوژێـت، لەکـۆڵ ئـەم ڕاکـە ڕاکـەی سـەربازییە دەبینـەوە و بەیەکجـاری دەحەسـێینەوە.
وتـی: تـۆ کـە لـە ژیانـی خـۆت بێزاریـت، مـن متەوعـم سـێ منداڵـم هەیـە، نامـەوێ بمـرم.
ماوەیەکـی زۆر لـەوێ ماینـەوە، شـەوێک لـە دوورەوە ئاگرێکمـان بـەدی کـرد. تەلەفۆنمـان بـۆ خـوارەوە کـرد، ئاگادارمـان کردنـەوە کـە ئاگرێـک لـە دوورەوە بـەدی دەکەیـن. وتیـان (تەقەتـان لێدەکـەن؟) وتمـان: نەخێـر.
وتیان (کەواتە لێی بگەڕێن، خۆتانی پێوە خەریک مەکەن).
شـەوان زۆر سـارد بـوو، لەسـەرمان خەومـان لـێ نەدەکـەوت.
عوسـمان کەسـێکی بـە ئەزمـوون بـوو، وتـی: وانابێـت، هەرچـی جلوبەرگتـان هەیـە شـەوان لەبەرخۆتانـی بکـەن، ئەوجـا سـەرماتان نابێـت، ئەگینـا ڕەق دەبنـەوە.
ئیتـر ئەوەبـوو، لـەو شـەوە بـەولاوە وامانکـرد و هیچـی تـر سـەرمامان نەبـۆوە.
دوای ماوەیـەک، لەوێـش ئێمەیـان گواسـتەوە بـۆ شـوێنێکی تـر، پێیـان دەوت (ئێڵـزە). شـوێنێکی خـۆش بـوو، خێمەمـان لـەوێ هەڵـداو سەنگەرێکیشـمان دروسـتکرد. بەفـر وەکـو جلۆکـە دەبـاری.
منیـش زۆر ماندووبـووم، بۆیـە تاقەتـم نەبـوو وەکـو ڕۆژانـی ڕابـردوو، هێسـترەکە لەگـەڵ خـۆم بگێـڕم، لـە ژێـر دار بـەڕووەکان پەلکـە داری وشـک و بـەڕووی کۆنـی بـۆ بدۆزمـەوە و بیلەوەڕێنـم.
بۆیـە لێـی خەوتـم، کاتێـک بەیانـی لەخـەو هەسـتامەوە، بینیـم

هێستـــرەکەمان لـــە برســـان و لـــە ســـەرمان ڕەق بۆتـــەوە و گیانـــی لەدەســـت داوە.
تەلەفۆنـم بـۆ بـارەگای سـریە کـردو پێمڕاگەیانـدن کـە هێسـترەکەمان لەسـەرمان تۆپیـوە. دوای کەمێـک لیژنەیەکیـان بـۆ لێکۆڵینـەوە لـە هـۆی گیـان لەدەسـتدانی نـاردە سـەنگەرەکەمان.
منیـش پێکەنیـم وتـم: جـا ئـەو هێسـترە زەغەلـە ئەوەنـدە دەهێنێـت ئێـوە بـۆی هاتـوون؟
یەکێـــک لـــە ئەندامانـــی لیژنەکـــە وتـــی: ئـــەو هێســـترە لەســـەر حکومـــەت بـــە هـــەزار و پێنـــج ســـەد دینـــارە، تـــۆ چـــی دەڵێـــی؟
لـەو ماوەیـەدا، سـەدام حوسـێن بیـرە نەوتەکانـی کوێتـی تەقانـدەوە، بەهـۆی ئـەوەوە ڕەنگـی ئـاوی بارانیـش ڕەش هەڵگەڕابـوو، تـام و بۆنـی نەوتـی لێدەهـات.
دوای حـــەوت مانـــگ لـــە داگیرکردنـــی کوێـــت لەلایـــەن ســـوپای عێراقـــەوە، دوای هەڵگیرســـانی شـــەڕی کەنـــداو لـــە لایـــەن وڵاتـــە یەکگرتووەکانـــی ئەمریـــکا و هاوپەیمانەکانـــی کـــە ســـوپای ســـی و چـوار وڵات بەنـاوی نەتـەوە یەکگرتـووەکان بەشـدارییان تێـدا کـرد، ســـوپای عێـــراق لـــە ڕێکەوتـــی ١٩٩١/٢/٢٦ لـــە کوێـــت وەدەر نـــرا و زیانێکـــی زۆریـــش، لـــە نێـــوان کـــوژراو و برینـــدار بـــەر ســـوپاکەی کـــەوت. تەنانـــەت لەبـــەر زۆری ژمـــارەی قوربانیانـــی ســـوپای عێـــراق، کـــە بـــە درێژایـــی ڕێـــگای نێـــوان کوێـــت و شـــاری بەســـرە وەکـــو گیشـــەی دار بـــە ســـەر یەکتـــر کەڵەکـــە ببـــوون. هـــەر بۆیـــە ئـــەو شـــەقامە بـــە ڕێـــگای مـــردن نـــاوی دەرکردبـــوو.
هـــەر لـــەو ماوەیـــەدا، جارێکـــی تـــر ســـریەکەی ئێمەیـــان گواســـتەوە بـــۆ بنـــاری چیـــای قەندیـــل لـــە ناوچـــەی پشـــت ئاشـــان و قرناقـــە. بـــە ئێمەیـــان وت (بڕۆنـــە ســـەر چیاکـــە و لـــەوێ خێمەکانتـــان هەڵـــدەن و ســـەنگەر دروســـتبکەن).

کـه گەیشـتینه سـەر لووتکـەی چیاکـە، شـوێنەواری سـەربازە ئێرانییـەکان هـەر لـەوێ مابـوو، واپێدەچـوو کەمێـک پێـش گەیشـتنی ئێمـە، ئـەوان لـەو شـوێنە کشـابنەوە. چونکـە هێشـتان پشـکۆی ئاگـری نـاو ئاگردانەکانیـان نەکوژابـۆوە. هەروەهـا قۆرییێـک چایەیـان لەسـەر ئاگردانەکـە بەجێهێشـتبوو، هێشـتان هـەر گـەرم بـوو.

ئێمـەش زۆر حەزمـان لـە چایـە بـوو، لـە بەیانییـەوە چایەمـان نەخواردبـۆوە، شەکریشـمان لـەلا نەبـوو، بـەڵام هەندێـک قەسـپمان پـێ بـوو، پەرداخێـک چایـەم تێکـرد و وەکـو قەنـداو لەگـەڵ قەسـپ خواردمـەوە.

زۆر تینوومـان بـوو، هیـچ ئاویشـمان لـەلا نەبـوو، هەندێـک بەفرمـان هێنـا، خسـتمانە نـاو دەممـان تاکـو تینووێتیمـان بشـکێ، بەفرەکـە لەبـەر دووکەڵـی بیرەنەوتـە گڕگرتووەکانـی کوێـت، ڕەنگـی ڕەش بـوو بـوو، هەروەهـا تامـی نەوتـی لێدەهـات.

هەرچۆنێـک بێـت، لـە تینووێتیـان هەندێکـم هـەر لێـی خـوارد، هەرچەنـد قوڕگـی گرتـم و زمانیشـم لەگەڵـی زوورایـەوە.

ئامیـر فەسـیلەکەمان ئێمـەی بەسـەر ئـەو سـەنگەرانە دابەشـکرد، کـە سـوپای ئێرانـی لـەدوای خۆیـان بەجێیـان هێشـتبوون.

یەکێـک لـە سـەربازەکان، ئیشـارەتی بـۆ یەکێـک لـە سـەنگەرەکان کـرد، وتـی: ئـەم سـەنگەرە جنۆکـەی تیایـە. مـن زۆر جـار لـە منداڵییـەوە گوێـم لـەم قسـانە بـووە، بـەڵام هەرگیـز بـاوەڕم پێـی نەکـردووە، بۆیـە وتـم: مـن دەچمـە ئـەو سـەنگەرە، جنۆکەشـم دەوێـت سـەری خـۆی دەربێنێـت، ئـەوکات دەزانـن چـی لێدەکـەم!!

شـەوێک ئێشـکگر بـووم، دوای ئـەوەی ئەرکەکـەم تـەواو بـوو، نـۆرەی سـەربازێکی تربـوو بێتـە شـوێنی مـن. چوومـە ژوور سـەری و لوولـەی چەکەکـەم خسـتە سـەر ئـەو بەتانیـەی لەسـەری بـوو،

وتم: هەستەوە نۆرەی تۆیە بێیتە شوێنم.
هەر لەو کاتەدا، لەژێر بەتانیەکە، دەنگی نووزە نووزێک دەهات، بە دەنگی مرۆڤ نەدەچوو. منیش لەدڵی خۆمدا وتم (تۆ بڵێی ئەوان ڕاست بکەن، ئەوە دەنگی جنۆکە بێت، دێتە گوێم!!).
دووبارە دەنگم دایەوە و پێم وت: هەستە، هەستە، واجبت بگرە.
دیسان لەژێر بەتانیەکە دەنگێک هات، بە لوورە لووری سەگ دەچوو. زۆر سەیرم پێهات، لە دڵی خۆمدا وتم (تۆ بڵێی هاوڕێیەکەم بووبێتە سەگ!!).
کاتێک بەتانیەکەم هەڵدایەوە، سەگێک لەژێر بەتانیەکە دەرپەڕی، لە سەگەش بەولاوە هیچ کەسێک لەژێر بەتانیەکە نەبوو. تەماشایەکی دەورووپشتی سەنگەرەکەم کرد، لەبەر تەمومژ چاوم هیچی نەدەبینی.
بانگی ئامیری سەنگەرەکەمانم کرد و پێموت: جەمال لەشوێنی خۆی نەماوە، لەژێر بەتانیەکەی ئەو سەگێکی لێ بوو، لەگەڵ دەنگی من ڕۆیشت. دەبێ ئەو کوڕە چی لێهاتبێت، تۆ بڵێی جنۆکەکان نەیانکردبێتە سەگ؟!
وتی: با بەیەکەوە بە وردی تەماشای دەورووپشتی سەنگەرەکە بکەین، نەوەک چووبێتە سەرئاو.
لە دوورەوە تارماییێکمان بینی، لە ورچ دەچوو. دەنگم دا وتم: تۆ کێی لەشوێنی خۆت بووەستە؟
کە وام وت، تارماییەکە بەرەو دواوە هەڵات.
جارێکی تر بەدەنگی بەرز هاوارمکرد پێموت: ئەگەر لە شوێنی خۆت نەوەستیت دەتکوژم، تۆ کێی؟
ئامیری سەنگەرەکەشمان بە زمانی عەرەبی پێی وت: قف

مكانـک، مـن انـت؟
بينيـم راناوەسـتێ، چەکەکـەم لێـی راکێشـا، ويسـتم تەقـەی لێبکـەم، دەسـتی بـۆ سـەرەوە بـەرز کـردەوە وتـی: نەمکـوژن، ئـەوە منـم جەمـال.
منيش وتم: بەو تەمومژە لەو شوێنە دوورە چی دەکەيت؟
وتی: چووم دەست بە ئاو بگەيەنم.
منيـش وتـم: جەمالـە قـوون ڕەش، کـێ بێـزی دێـت تەماشـای قوونـی تـۆ بـکات، بۆچـی وا دوور کەوتيتـەوە، هێنـدەی نەمابـوو بتکـوژم، جارێکـی تـر ئـەوە دووبـارە نەکەيتـەوە.
بـۆ بەيانـی لـە بـارەگای سـريە تەلەفۆنيـان بـۆ کـردم، تـۆ و سـەربازێک وەرنـە خـوارەوە، بـۆ وەرگرتنـی ئازووقـە بـۆ سـەنگەرەکەتان.
منيـش لەگـەڵ سـەربازێک چوومـە خـوارەوە بـۆ بـارەگای سـريەکەمان. کـە گەيشـتينەجێ، يـەک مريشـک و دوو کەلـەم و هەندێـک سـەموون و خورمايـان داينـێ.
کـە گەڕاينـەوە بـۆ شـوێنی خۆمـان، سـەربازێکی عەرەبيـش لـە ئيجـازە گەڕابـۆوە، ئەويـش لەگەڵمـان هـات. کـە گەيشـتينە گونـدی قەرناقـە، لەوێـوە ڕێـگای چوونـە سـەرەوەمان بـۆ چيـای قەنديـل لـێ ون بـوو. بەفرێکـی زۆر باريبـوو، ڕێگايەکـەی داپۆشـيبوو.
لـە سـەرمان هـەردوو قاچەکانـی خۆمـم بـە نايلـۆن پێچايـەوە تاکـو بەفـر نەيسـووتێنێ. پێـش ئـەوەی بگەينـە شـوێنی خۆمـان، ئـەو سـەربازە عەرەبـەی لەگەڵمـان بـوو هێـزی ڕۆيشـتنی نەمـا و کـەوت.
کـە سـەيرمان کـرد، هـەردوو قاچەکانـی تـا سـەر گۆزينگـی بەفـر سـووتاندبوونی، مـۆر ببـوون.
بەهەردووکمـان هەڵمانگـرت و گەياندمانـە ژێـر دارێـک و لـەوێ بەجێمانهێشـت. ئێمـەش بـەرەو سـەنگەرەکەمان بـەڕێ کەوتينـەوە.

کە گەیشتینەجێ، سەربازەکان هاتنە پێشوازیمان. جەمال وتی: ئەوە چیتان بەسەر هاتووە، بۆچی هێندەتان پێچوو؟

منیش وتم: لەلای گوندی قەرناقەوە ڕێگامان لێ ون بوو، بەفر ڕێگاکەی داپۆشیبوو. ئێمە سەلامەتین، بەڵام ئەبوو حەیدەر لە سەرمانبەستی و لە قاچ کەوت، لەژێر دارێک بەجێمان هێشتووە، بڕۆن بیهێننەوە.

ماوەیەکی زۆر لەو سەنگەرە ماینەوە، شوێنەکەی زۆر خراپ و مەترسیدار بوو، لەلایەک بەژنێک بەفری لێکەوتبوو، لەلایەکی تریشەوە گورگی زۆر بوو، شەوان ڕوویان تێدەکردین، بە کۆمەڵ بەسەریان دادەداین. چاوەکانیان وەکو چرا دەتریسکایەوە، لەترسی ئەوان، نەماندەوێرا بچینە خوارەوە بەشە ئازووقەی خۆمان بێنین. ئەو ئازووقەی لەلاشمان بوو، هیچی نەما.

سەگێکمان هەبوو، زۆر خۆشمان دەویست، ماوەیەکی زۆر بوو لەگەڵمان بوو، بۆ هەرکوێ بچووباین، ئەویشمان لەگەڵ خۆمان دەبرد.

ڕۆژێک لەبرسان بیرم لە کوشتنی ئەو سەگە کردەوە. بە سەربازە کوردەکانم وت: برایان وەختە ئێمە لە برسان بمرین، کەسیش خۆی لێمان بە خاوەن ناکات، ئێمەش لەبەر ئەو بەفرە زۆرە و مەترسی ئەو گورگانە ناتوانین بگەڕێینەوە بارەگای سریە. بۆیە بڕیارم داوە ئەو سەگە بکوژم و گۆشتەکەی بخۆین. کەوام وت، خودێدە وتی: بەخوا ئەگەر بشمرم لەبرسان، گۆشتی سەگ ناخۆم.

منیش وتم: ئێوە گۆشتی سەگ دەخۆن، ناخۆن، کێشەی خۆتانە، من هیچی تر بەرگەی برسێتی ناگرم، دەیکوژم و گۆشتەکەی دەخۆم.

چەکێکی ئار بی کەیم پێبوو، چوومە دەرەوەی سەنگەرەکەن

لــە ســەگەکە نزیــک کەوتمــەوە و چەکەکــەم لەبەرامبــەری ڕاکێشــا، ویســتم بیکــوژم. ســەگەکە، زۆر بــە زەلیلــی لەبەرامبــەرم چۆکــی دادابــوو، چاوەکانــی پــڕی ئــاو بــوون. بەزەییــم پێــی هاتــەوە، لــە خەفەتــی ئــەو چاوەکانــی منیــش پــڕی ئــاو بــوون. لــە دڵــی خۆمــدا وتــم (ســاڵێک زیاتــرە ئــەو ســەگە بەســتەزمانە پاســەوانیمان لەگــەڵ دەکات، چــۆن دەبــێ مــن هێنــدە بــێ بەزەیــی بــم، وەکــو دڕنــدە بیکــوژم).

ئیتــر ئەوەبــوو، لوولــەی چەکەکــەم لــە ئاســمان کــرد و یــەک مەخــزەن فیشــەکم بــە ئاســمانەوە نــا. ســەربازێکی عــەرەب لەگەڵمــان بــوو، نــاوی جــەواد کازم بــوو، خەڵکــی شــاری کــووت بــوو، تۆزێــک سەرشــێت بــوو. شــەڕی لەگــەڵ گشــت ســەربازە کوردەکانــی ســەنگەرەکەمان کردبــوو، تەنهــا گێچەڵــی بەمــن نەفرۆشــتبوو. لوولــەی چەکەکــەم لــە ســینگی کــرد و پێمــوت: تــۆ هیــچ ســوودێکت بــۆ ئێمــە نییــە، وەســیەتی خــۆت بکــە، هــەر ئێســتا دەتکــوژم.

زۆر لێم پاڕایــەوە وتــی: بیکــە خاتــری خــوا و پێغەمبــەر مەمکــوژە. وتــم: پاڕانــەوە دادت نــادات، وەختــە بمــرم لەبرســان، تــۆش کەسێکی زۆر خراپیــت، لەجیاتــی ئــەو ســەگە تــۆ دەکــوژم، چونکــە ئــەو ســەگە لــە تــۆ باشــترە.

لەگــەڵ دەنگــە دەنــگ و بۆڵــە بۆڵــی ئێمــە، ســەربازەکانی ســەنگەرەکەی دراوســێمان، هاتنــە لامــان. کــە ئــەو دیمەنەیــان بینــی، کەوتنــە نێوانمــان، زۆر لێــم پاڕانــەوە و داوایــان لێکــردم کــە هەڵەیەکــی وا نەکــەم. بــەڵام بــێ ســوود بــوو، مــن هــەر سوور بــووم لەســەر بڕیــاری خــۆم وتــم: وەختــە بمــرم لەبرســان، ئێــوە خواردنێکــی زۆرتــان بۆخۆتــان شــاردۆتەوە و زگتــان تێــرە، ئاگاتــان لــە حاڵــی مــن نییــە.

کـه وام وت، سـەربازەکانی سـەنگەرەکەی دراوسـێمان، کـە هـەر هەموویـان عـەرەب بـوون، بەڵێنیـان پێـدام ئەگـەر نەیکـوژم خواردنـم بـۆ بێنـن.
ئیتـر ئەوەبـوو، چەکەکـەم لەسـەر سینگی جـەواد لابـرد و لەگـەڵ ئـەو سـەربازانە چوومـە سـەنگەرەکەیان. کیسـەیەک قەسـپیان لەلابـوو، لەبەردەمـی منیـان دانـا وتیـان: سـوێند بـە خـوا و محەمـەد و عەلـی تەنهـا ئەوەنـدە قەسـپەمان لایـە، فەرمـوو خـۆت و ویژدانـت چـی لێدەکـەی بیکـە.
منیـش قەسـپەکانم هێنـا، بـە یەکسـانی بەسـەر هەموانـم دابەشـکرد. یەکـی پەنجـا و پێنـج دەنکمـان بەرکـەوت. چەنـد ڕۆژێکمـان بـەو بـڕە قەسـپانە بەڕێکـرد، ڕۆژی چەنـد دەنکێکمـان لێـی دەخـوارد.
دوای چەنـد ڕۆژێـک ئامیـر فەسـیل، سـەنگەرەکانی بەسـەرکردنەوە، هاتـە لامـان. جـەواد شـکایەتی لێکـردم وتـی: گـەورەم ئەبـو شـوارب ویسـتی بمکوژێـت.
ئامیـر فەسـیلیش وتـی: خـۆزگا بیکوشـتبایت، دیـارە کەسـێکی زۆر خراپیـت بۆیـە ویسـتوویەتی بتکوژێـت. ئەمـەی وت و بـە پێکەنینـەوە وتـی: بۆچـی نەتکوشـت؟
جەوادیـش ڕووی لـە ئامیـر فەسـیل کـرد و پێـی وت: گـەورەم تـۆ چـۆن وادەڵێـی، بەڕاسـتیمە ئـەو ویسـتی بمکوژێـت.
ئامیـر فەسـیلیش وتـی: منیـش بـە ڕاسـتیمە، تـۆ کەسـێکی زۆر بێکەڵکیـت، خـۆزگا تـۆی بکوشـتبا.
لـە ڕاسـتیدا لـەو ماوەیـە زۆر شـت ڕوویدابـوو، ئێمـە پێمـان نەزانیبـوو. دیاربـوو ئـەوان ئـاگاداری جموجووڵـی پێشـمەرگە و ناڕەزاییەکانـی خەڵکـی کوردسـتان بـوون.
ئـاگاداری ئەوەبـوون، کـە سـوپای عێـراق لەلایـەن هێزەکانـی

ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی لە کوێت وەدەرنراوە و لە هەموو شوێنێک تێکوپێک شکێندراوە.
ئامیر فەسیل هەندێک لەگەڵمان مایەوە، کاتێکی خۆشمان بە قسەی خۆش و بە پێکەنین لەگەڵ ئەو بەسەربرد. دوایی ئەو گەڕایەوە بارەگای سریە.
تازە ڕۆژ ئاوابیوو، لە بارەگای سریە تەلەفۆنم بۆ کرا، داوایان لێکردم بە پەلە بچمە خوارەوە بۆ بارەگای سریە. منیش وتم: کاتەکەی درەنگە، شەوم بەسەرداد‌ێت، ناکرێ بە تەنها بێمە خوارەوە.
وتیان: ئامیر داوای تۆی کردووە، دەیەوێ هەر ئێستا چاوی پێت بکەوێ.
سەنگەرەکەمان نزیکەی دوو کیلۆمەتر لە بارەگای سریە دوور بوو، خۆم توند پێچایەوە و چەکەکەم بە شانم وەکرد و بە تەنیا بەڕێکەوتم. لەبەر تەمومژ چاو چاوی نەدەبینی، زۆر ترسام، لە ترسان دەستم بە غاردان کرد، تاکو زوو بگەمە جێ. لەوکاتەدا گوێم لە دەنگی تەپەی شتێک بوو لەپشتم دەڕۆیشت. هەڵویەستەیەکم کرد و تەماشایەکی پشتەوەی خۆمم کرد. هیچم نەبینی. دیسان دەستم بە ڕۆیشتن کردەوە، دیسان دەنگی تەپەتەپەکە لەپشتمەوە هات. کە لە شوێنی خۆم دەوەستام، تەپەتەپەکەش نەدەما.
زۆر ترسام لە دڵی خۆمدا وتم (لەوانەیە درندە بێت، بیەوێ پەلامارم بدات). چەکەکەم راکێشا و بە خێرایی ئاوڕێکم لە پشت خۆم دایەوە، بینیم سەگەکەی خۆمان، بەدوامەوەیە.
بەهەرحاڵ، گەیشتمە بارەگای سریە، چوومە لای ئامیر سریە، وتم: گەورەم چیتان لێم دەوێ؟
وتی: تۆ ئەمشەو لێرە پاسەوانی بکە.

ئیتر ئەوەبوو، ئەو شەوە لەبەر دەرگای ئامیر سریە تاکو بەیانی پاسەوان بووم. دیاربوو موراسیلی ئامیر سریە هەندێک شتی دەزانی کە ئێمە نەماندەزانی. وتی: ئەگەر واجبەکەشت تەواو بوو تۆ مەگەڕێوە سەنگەرەکەتان. وا باشترە ئەو ماوەیە تۆ لێرە لەگەڵ ئێمە بیت. منیش سەیرم بە قسەکانی هات وتم: شتی وا چۆن دەبێت، ئەگەر نەگەڕێمەوە شوێنی خۆم، ئامیر سریە سزام دەدات. کە وام وت، بێدەنگ بوو، هیچی تری نەوت.

درەنگی شەو گوێم لە دەنگی کەسێک بوو، وامزانی ئامیر فەسیلەکەمانە، بەناوی خۆمەوە بانگی کردم، منیش بەدەنگی بەرز هاوارم کرد وتم: بەڵێ گەورەم.

ئامیر سریە کە گوێی لە دەنگم بوو وتی: بێدەنگ بە، ئەوانە موخەڕیبن بەسەریان داداوین، تەقەی لێبکە و بیکوژە.

منیش وتم: گەورەم ئەگەر ئەو کەسە موخەڕیب بێت، چۆن ناوی من دەزانێت؟

وتی: من پێت دەڵێم ئەوانە موخەڕیبن، تەقەیان لێبکە.

ئێمە لەم مشت و مڕەدا بووین، جارێکی تر ئەو کەسە بانگی کردمەوە، ئەمجارەیان بەناوی خۆم و باوکم بانگی کردم.

منیش وتم: لە شوێنی خۆت بووەستە، تۆ کێیت، خۆتم پێبناسێنە؟

وتی: من عوسمانم، جەمال خودێدەو عەلیشم لەگەڵدایە.

کە لێیان نزیک بوومەوە، ڕووی لایتەکەم لە دەموچاویان کرد، خۆیان بوون.

وتم: خێرە بەو نیوەشەوە دابەزیون؟

وتی: هاتووینە تۆش لەگەڵ خۆمان ببەین و ڕابکەین.

منیش وتم: ئەو بیرۆکەیەتان لەکوێ هێنا؟ دوێنێ لەگەڵتان

بـووم، باسـێکی لـەم شـێوەیەتان نەکـرد؟!
وتـــی: خەڵکــی ڕانیـــە دژی ڕژێمـــی بەعـــس ڕاپەڕیـــون، بەســـەر بارەگاکانـی حیزبـی بەعسـیان داداوە و گشـت ڕەفیـق حیزبیەکانیـان کوشـتووە.
قســـەکانی عوســـمان نەچـــووە ئەقڵمـــەوە، بۆیـــە ڕازی نەبـــووم لەگەڵیـان ڕابکـەم. وتـم: ئێـوە بـە ئـارەزووی خۆتـان بکـەن، مـن ڕاناکـــەم لێـــرە دەمێنمـــەوە.
ئیتـــر ئەوەبـــوو، ئـــەوان ڕۆیشـــتن و منیـــش لـــە بـــارەگای ســـریە مامـــەوە.
بۆ بەیانی، ئامیر سریە هاتە لام وتی: حەزت لە چایە؟
وتم: بەڵێ گەورەم.
وتی: چەند ڕۆژ دەبێ چایەت نەخواردۆتەوە؟
وتم: زۆر لە مێژە چایەم نەخواردۆتەوە، وەختە بۆی شێتبم.
وتی: پێش ئەوەی بمرین با بەیەکەوە چایەک بخۆینەوە.
منیش وتم: گەورەم هیچ مەترسیێک لە ئارادا هەیە؟
وتـــی: جـــارێ تـــۆ بـــڕۆ ژوورەکـــەی مـــن، هەندێـــک تـــۆ چـــا و شـــەکر بێنـــە، چایـــەک بـــۆ خـــۆم و خـــۆت لێبنـــێ. بـــا ئـــەو چایـــەش بخۆینـــەوە، خـــوا گەورەیـــە بـــۆ بەیانـــی.
قۆرییێـک چایـەم لێنـا و هەریـەک و پەرداخێـک چایەمـان خـواردەوە.
بـەدەم چایـە خواردنـەوە وتـی: تـۆ دەزانـی لـەم سـریە گەورەیـە تەنهـــا نـــۆزدە ســـەربازی لـــێ ماوەتـــەوە. هەمـــوو ڕایانکـــردووە و بەجێیـــان هێشـــتووین.
منیـش بـێ ئاگابـووم، نەمزانـی چـی ڕوویـداوە، هـەر وامزانـی بـە گاڵتــە وادەڵــێ، بۆیــە پێکەنیــم و هیــچ دەنگــم نەکــرد.
پـــاش ئـــەوەی چایەکەمـــان خـــواردەوە، پەرداخەکانـــم شوشـــتن و بردمــە ژوورەوە. ئامێــرە ڕاکاڵــە بێتەلەکــە دەنگــە دەنگێکــی لێــوە

دەهـات، دەیـوت (سیانزە....سـیانزە...، گوێـت لێمـە؟).
منیـش بانگـی ئامیـر سـریەم کـرد، وتـم: گـەورەم کەسـێک لـە ئامێـری ڕاکاڵـە بێتەلەکـە تـۆی دەوێ.
ئەویـش هاتـە ژوورەوە، ئامێرەکـەی هەڵگـرت، وتـی: سـیانزە... سـیانزە. ئامیـر سـریەی پێنـج لەگەڵتدایـە.
ئامیـر فەوجـی لەگـەڵ بـوو، وەڵامـی دایـەوە وتـی: گـەورەم ئامیـر سـریەی پێنجـت لەگەڵدایـە. ئامیـر سـریە بەتوورەیـی پێـی وت: تـۆ ئامیـری نەعامـەی نـەک ئامیـر فـەوج. قەشـمەر ئێمـە دەمێکـە چاوەڕێـی ئێـوە دەکەیـن، زووکـە وەرە لام. بارودۆخەکـە زۆر خراپـە، بـە پەلـە لێـرە دەکشـێینەوە.
ئەویش وتی: چی بکەین؟
وتی: تەنها چەکەکان لەگەڵ خۆتان بهێنن.
گشـت چەکەکانـی سـریەمان کۆکـردەوە، نزیکـەی نۆهـەت پارچـە چـەک بـوو، لـە هێسـترێک بارمانکـرد و بـەرەو بـارەگای فـەوج ڕۆیشـتین.
ڕێگایەکەمـان زۆر ناخـۆش بـوو، بـاری منیـش زۆر گـران بـوو، چەکەکـەم و هەندێـک قونبەلـەی ڕومانـە و سـێ مەخزەنـی فیشـەکم پێبـوو.
نـاوە نـاوە ڕومانەیەکـم دەتەقانـدەوە، ئامیـر سـریەش ئـاوڕی لێـم دەدایـەوە و دەیـوت: چـی بـوو، بۆچـی ئـەو قونبەلانـە دەتەقێنیتـەوە؟
وتم: گەورەم هەست دەکەم ئەوان بەدواوەی ئێمەوەن.
وتی: وریابە نەکەوینە بەردەستیان، دەنا دەمانکوژن.
منیـش وتـم: هیـچ خەمـت نەبـێ، ئـەی ئـەو هەمـوو چـەک و تەقەمەنییەمـان بـۆ چییـە، ئەگـەر بەوانـە بەرگـری لەخۆمـان نەکەیـن.

هەندێکـی تـر ڕۆیشـتین، هێسـترەکە بـاری زۆر گـران بـوو، خـۆی بەردایـەوە و کەوتـە نـاو کەندەڵانێـک.
ئامیر سریە وتی: بڕۆن ئەو هێسترە بە چەکەوە بێننەوە؟
منیـش وتـم: گـەورەم شـوێنەکەی زۆر خراپـە، پێمـان نایەتـەوە، مەگـەر بچیـن چەکـەکان لـە شـوێنی خـۆی بتەقێنینـەوە، تاکـو ئـەوان بـەکاری نەهێنـن.
وتـی: بیرۆکەیەکـی خـراپ نییـە، بـەڵام تـۆ ئاربـی کەیەکـەی خـۆت فڕێبـدە و بـی کـەی سـێیێک هەڵبگـرە. بـۆ بەرگریکـردن لەخۆمـان ئیشـمان پێـی دەبێـت.
منیـــش وتـــم: گـــەورەم بـــی کـــەی ســـی زۆر قورســـە، ناتوانـــم هەڵیبگـرم، بـە چ حاڵێـک ئـەو ئـار بـی کەیـەم پێهەڵگیـراوە!!
وتی: هیچ ڕومانەت پێماوە؟
وتم: ئەی چۆن.
وتی: دانەیەکم بدەرێ.
منیش ڕومانەیەکم دایە.
چووینـە لای هێسـترەکە، بـاری چەکەکانمـان لێـی کـردەوە، ئامیـر سـریە ڕومانەکـەی بەچەکـەکان تەقانـدەوە.
ویسـتمان هێسـترەکە لەگـەڵ خۆمـان بێنینـەوە، بـەڵام هێسـترەکە زۆر بێهێـــز بـــوو، هەرچەنـــدی هەوڵمـــان لەگەڵـــی دا، نەیتوانـــی هەســـتێتەوە. چـــواردەورەی بەفـــر بـــوو، بەزەییـــم پێـــی هاتـــەوە ویسـتم بیکـوژم. سـەربازێک وتـی: لەجیاتـی ئـەوەی بیکوژیـن، بـا تۆزێـک بەفرەکـەی بەردەمـی خاوێـن بکەینـەوە، بۆخـۆی نـاوە نـاوە کەڵـــە پووشـێک دەخـوات و هێـزی دێتەوەبـەر.
ئیتـــر ئەوەبـــوو، بەردەمـــی هێســـترەکەمان خاوێـــن کـــردەوە و هەندێـک پەلکـە چـرووی وشکیشـمان لەبەردەمـی دانـا و لـەوێ بەجێمانهێشـــت.

بەڕێکەوتیـــن تاکـــو گەیشـــتینە قەڕناقـــە. ڕووبارێکـــی گەورەمـــان هاتـــە پێـش، نەموێـــرا خۆمـــی لێبـــدەم و لێـــی بپەڕمـــەوە. بـــە سـەربازەکانم وت: لـەو ئـاوە زۆر دەترسـێم ناوێـرم خۆمـی لێبـدەم، سوپاسـگوزارتان دەبـم ئەگـەر یارمەتیـم بـدەن و بمپەڕێننـــەوە. ئەوانیـش دەسـتیان گرتـم، لەگـەڵ خۆیـان لـە ئاوەکـە منیـان پەڕانـدەوە. کـە پەڕینـەوە، جلەکانمـان بەتەواوەتـی تەڕبـوون، لەسـەرمان وەکـو کێـچ دەلەرزیـن.

هیـچ یەکەیەکـی سـەربازی لـەو دەوروبـەرە نەمابـوون، دەتـوت زەوی قووتـی داون، تەنانـەت سـەگەکانیش وەکـو مێگـەل لەدوامـان دەڕۆیشـتن.

وەکـو وتـم، زۆربـەی سـەرباز و پلـەداری سـریەکەمان ڕایانکردبـوو، تەنها ئێمـە نـۆزدە سـەرباز لەگەڵ ئامیـر سـریە مابووینـەوە. بـەرەو پشـت ئاشـان بەڕێکەوتیـن، سـەربازەکان زۆر مانـدوو و شـەکەت ببـوون، مـن لـەوان باشـتر بـووم، زۆر بـە خێرایـی دەڕۆیشـتم، بۆیـە لـەوان دابـڕام و پێـش ئـەوان گەیشـتمە پشـت ئاشـان.

کـە گەیشـتمە ئـەوێ، یەکێـک بەدەنگـی بـەرز وتـی: لەشـوێنی خـۆت بووەسـتە و خـۆت بناسـێنە؟

منیـش لـە شـوێنی خـۆم ڕاوەسـتام و خـۆم پێـی ناسـاند، وتـم: سـەربازم لـە فەسـیلی یـەک، سـریەی پێنـج، فەوجـی بیسـت و چـوار.

دوای تۆزێـک ئامیـر سـریە و ئامیـر فەسـیل و چەنـد سـەربازێکی تریـش گەیشـتنە لامـان.

لـە سریەکەمان تەنیا پێنـج سـەربازماینـەوە، لەگـەڵ ئامیـر سـریە و ئامیـر فەسـیل بـەردەوام بووین لـە ڕۆیشـتن. لـە ماندووبوونـان، قاچەکانـم لـەدوام نەدەهاتـن. هەندێـک ڕۆیشـتین، سـەیارەیەکی ئیڤـا بەتەنیشـتمان تێپـەڕی، هەندێـک کەسـی بـە جـل و بەرگـی

کوردی تیابوو. بۆی ڕاگرتین، هەتا ئامیر سریه و ئامیر فەسیل سواری بوون، ویستی بڕوات و بەجێمان بهێڵێ، بەڵام من قاچێکم کردە دووان و بە ڕاکردن خۆم گەیاندێ و بەسەرکەوتم.
یەکێک لە کەسەکان ڕووی تێکردم وتی: ئەو چەکەی تۆ زۆر خاوێنە، بۆچی نایدەیتە من؟
منیش زۆر ڕقم لە جاشان دەبۆوە، بۆیە وتم: دیارە تۆ زۆر بێ ئەقڵیت، من سەربازم، ئەو چەکە زممەیە لەسەر من، چۆن دەیدەم بە تۆ!!
ئەویش وتی: من هیچت پێنالێم، بەڵام بیدەیتە ئێمە باشترە، نەوەک کەسانێکی تر بەزۆری لێتبستێنن.
دەتوت من لە گوێی گادا خەوتووم، تێنەگەیشتم، نەمزانی چی ڕوویداوە. وتم: من خۆم لەسەر ئەو چەکە دەکوژم.
وتی: باشە دوایی دەتبینینەوە.
زۆر ڕۆیشتین تا گەیشتینە ناوچەی چۆمان، بارەگای فەوجەکەمان لە شوێنی خۆی نەمابوو. چاومان گێڕا، هیچ بنکە و یەکەیەکی سەربازیمان لەوێ نەبینی. سەربازگە و سەنگەرەکان هەموو چۆڵکرابوون.
زۆری تر بە پێ ڕۆیشتین تاکو گەیشتینە پردێکی ئاسن لەسەر ڕووبارەکە. لەوێ هەندێک سەرباز و چەند ئەفسەرێکمان بینی، وتیان (ئەمشەو لێرە دەمێنینەوە، بابزانین بەیانی چ فەرمانێکمان پێدەکەن).
ئامیر سریەکەشمان کە بینی تەنها ئێمە چوار سەرباز لەگەڵی ماوینەتەوە، ڕووی لەمن کردو وتی: ئەوانی تر هەموویان داخیلی هرووب بکە، فەرمانیان بۆ دەربکە بڵێ ڕایانکردووە.
منیش وتم: گەورەم ئەوە تۆ چی دەڵێی، جارێ کاتی ئەو شتانە نییە، بابزانین چی ڕوویداوە، خۆ تەنها سەربازەکانی

ئێمە ڕایان نەکردووە، ئەوەتا سەربازەکانی یەکە سەربازیەکانی ئێرەش ون بوونە، دەڵێی زەوی قووتی داون. ئەگەر هەر سووریشی لەسەر دەرهێنانی فەرمان بۆیان، ئەوا هەر هەموویان بە ونبوو دەنووسم.
بەهەرحاڵ شەومان بەسەرداهات، ئەو چووە لای ئەفسەرەکانی ئەو یەکە سەربازیە و منیش لەگەڵ سەربازەکان پاسەوانیم دەکرد.
درەنگی شەو مودەڕەعەیەکی سەربازی بەرەو لای من هات، لە تەنیشت من ڕایگرت، کەسێکی لەسەر بوو، دوو ئەستێرەی لەسەر شان بوو، پێی وتم: خۆت پێشکەش بکە، داوای نهێنی شەوی لێ نەکردم. بەردەوام بوو لە قسەکانیدا وتی: ئەوە بۆچی بەتەنهای؟ وتم: تەنها نیم، هەندێک سەربازی تریشم لەگەڵدایە، دابەش بوونە بەسەر ئەو دوو سەنگەرەدا.
وتی: باشە.
وتم: ئیشارەتیان بدەمێ تاکو وەڵام بدەنەوە؟
وتی: نا پێویست ناکات، خوا بتپارێزێت.
ئەوەندەی وت و ڕۆیشت. زۆر سەیرم پێی هات، لە بیری خۆمدا وتم (خۆ ئەو کەسە بێریەی لەسەر نەبوو، داوای نهێنی شەویشی لە من نەکرد، ئەفسەر چۆن وادەبێت).
چواردەورم چۆڵ بوو، لە دەنگی خوڕەی ئاوەکە بەولاوە گوێم لە دەنگی هیچ شتێکی تر نەدەبوو. زۆر ترسام، بەخێرایی خۆم گەیاندە ژووری ئامێر سریەکەمان، وتم: گەورەم واپێدەچێت سەربازێکی کەم لێرە مابێنەوە، زۆربەیان ڕۆیشتوون و بەجێیان هێشتووین.
وتی: هەستت بەهیچ جووڵەیەکی نائاسایی کردووە وا دەڵێی؟
وتم: تۆزێک پێش ئێستا مودەڕەعەیەکی سەربازی بێرەداهات،

لـە تەنیشـت مـن ڕایگـرت و داوای لێکـردم خۆمـی پـێ بناسـێنم. وابزانـم ئـەو کەسـەی لەنـاوی بـوو، پێشـمەرگە بـوو.
وتی: خۆ هیچت پێی نەوت؟
وتـم: داوای نهێنـی شـەوی لـێ نەکـردم، بـەڵام لێـی پرسـیم هـەر بەتەنیـا لێرەیـت؟
کـە وام وت، ئامیـر سـریە ڕەنگـی تێکچـوو، وتـی: خـۆ زانیاریـت پێـی نـەدا؟
وتـم: پێمـوت (تەنهـا ئێمـە و چەنـد سـەربازێکین، دابـەش بووینـە بەسـەر دوو سـەنگەردا).
ئامیـر سـریە کـە ئەمـەی گـوێ لێبـوو، هەسـتایە سـەرپێ وتـی: ئـەو کەسـە موخەڕیـب بـووە، ئێمـە لـە حاڵەتـی ئامادەباشـی و ئینـزاری جیـم دایـن. بـەم شـەوە درەنگـە هیـچ ئالییەتێکـی ئێمـە بۆی نییـە هاتوچۆ بـکات. تـازە بەسـەرمان دادەدەن و دەمانکوژن.
منیـش وتـم: جـا چـی بکەیـن گـەورەم؟ وتـی: بـەم شـەوە هیچمـان پێناکـرێ، تـۆ ئەمشـەو بەتەنیـا بەجێـم مەهێڵـە، لەگـەڵ موراسـیلەکەم بەیەکـەوە پاسـەوانی بکـەن. بەیانـی بەیەکـەوە دەچینـە بـارەگای فەوجەکەمـان، ئـەوەی بـۆ منـت باسـکرد، بـۆ ئامیـر فەوجـی بگێـڕەوە بزانیـن چـی دەڵێـت.
مـن نەمدەزانـی چـی ڕوویـداوە، بۆچـی ئامیـر سـریە وا ڕەنگـی تێکچـوو، لەدڵـی خۆمـدا وتـم (ئـەوان هـەر وان، زۆر ترسـنۆکن، بـە دڵۆپێـک ئـاو دەکەونـە مەلەکـردن).
بەیانی کـە ئامیـر لەخـەو هەستایەوە، بەپەلـە خـۆی گـۆڕی و منـی لەگـەڵ خـۆی بـردە سـەر شـەقامەکە. ئیڤایەکـی سـەربازی بەوێـدا هـات، زۆر بـە خێرایـی لێـی دەخـوڕی. دەسـتی لـێ ڕاگـرت، بـۆی ڕاگرتیـن. ئامیـر سـریە چـووە پێشـەوە و منیـش سـواری دواوە بـووم. لـەدواوە چەنـد کەسـێکم لەنـاو ئیڤاکـە بینـی جـل و بەرگـی

کوردییــان لەبەردابــوو، هەریــەک و کلاشــینکۆفێکیان بەدەســتەوە بــوو. وامزانــی جاشــن ســڵاوم لێکــردن و ســڵاویان لێوەرگرتمــەوە.
کــە گەیشــتینە جــێ، دابەزیــن و چووینــە نــاو بــارەگای فــەوج. نزیکــەی چــل تــا پەنجــا ســەربازێکی لێبــوو. ئامیــر سریە چــووە ژووری ئامیــر فــەوج و ســڵاوی لــە کەســێک کــرد، ئەویــش ســڵاوی لێوەرگرتــەوە و وتــی: تــۆش هاتــی؟
وتــی: هاتــووم شــتێکت پێبڵێــم، ئــەو ســەربازەی لەگەڵمدایە، دوێنــێ شــەو لەکاتــی پاســەوانی ڕووداوێکــی ســەیری بینیــوە، واپێدەچێــت جووڵەیەکــی نائاســایی لــە ناوچەکەمــان هەبێــت. لەگــەڵ خــۆم هێناومــە تــا بۆتۆشــی بگێڕێتــەوە بزانیــن فەرمانــت چییــە؟
وتی: دەزانم پێویست بە گێڕانەوە ناکات.
ئەمەی وت و ئێمەش هاتینە دەرەوە.
بــە ئامیــر سریەم وت: بەڕاســتی ئــەو کەســەی تــۆ قســەت لەگــەڵ کــرد، ئامیــر فــەوج بــوو؟
بۆچی وادەڵێی؟
وتم: ئەی بۆچی هیچ ڕوتبەی لەسەر شان نەبوو؟
کــە ئەمــەم وت، ســەری ســوڕما، گەڕایــەوە ژوورەوە و بــە ئامیــر فەوجــی وت: گــەورەم بۆچــی ڕوتبەکانــت لەســەر شــان نییــە؟
ئەویــش بــە تووڕەیییــەوە وتــی: چونکــە ئێمــە ترســنۆکین، تەنیــا تــۆ ئازایــت، بۆیــە هیــچ نەشــڵەژاویت! ئامیــر ســریەکەمان هاتــە دەرەوە و پێــی وتــم: تــۆ ڕاســت دەکــەی، ئامیــر فــەوج بــە ئەنقەســت ڕوتبەکانــی لەســەر شــانی خــۆی هێناوەتــە خــوارەوە. دیــارە زۆر شــت دەزانێــت کــە ئێمــە نایزانیــن.
ئەمــەی وت و دەســتی منــی گــرت و منــی بــردە پەنایەکــەوە و پێــی وتــم: تــۆش ئــەو ڕوتبانــە لەســەر شــانم بکــەوە، هیچــی تریــش پێــم مەڵــێ گــەورەم. مــن گــەورەی تــۆ نیــم، ئێســتا تێگەیشــتی؟

وتم: بەڵێ گەورەم.

وتی: تۆ بەو گەورەم گەورەمە قورم بەسەر دەکەیت، ئەی پێم نەوتی پێم مەڵێ گەورەم؟ کار لە کار ترازاوە، سوپا نەماوە، پێم بڵێ گەواد، پێم مەڵێ گەورەم.

منیش وتم: بۆچی ورەت بەرداوە گەورەم؟

وتی: ئاخ لە دەستی تۆ، من گەوادم، ئیتر لەمەودوا گەورەی کەس نیم، ئیتر تێگەیشتی؟!

ئێمە لەو قسانەدابووین، هەلیکۆپتەرێک لە نزیک بارەگای ئامیر فەوج نیشتەوە، دوو ئەفسەری پلەدار لێی دابەزین، بەڕاکردن بەرەو ژووری ئامیر فەوج هاتن. چوونە لای ئامیر فەوج.

هێندەی پێنەچوو، ئامیر فەوج لەگەڵیان هاتە دەرەوە و بە ئامیر سریە و ئەو ئەفسەرانەی تری وت، کە لەبەردەم ژوورەکەی کۆ ببنەوە گوتی: من دەڕۆمە بارەگای فەیلەق، ئێوەش ئازادن چی دەکەن یان نایکەن، هیچ فەرمانێکم بۆتان پێنییە، پێتان ناڵێم شەڕبکەن یان نەیکەن، بە ئارەزووی خۆتان بکەن.

ئەمەی وت و سواری هەلیکۆپتەرەکە بوو، ڕۆیشتن و هەموومانی لەوێ بەجێهێشت.

ڕەئیس ئەرکانی فەوجەکەمان، ئەفسەرێکی عەرەب بوو، وێڕای ئەوەی داوای لێکرد کە ئەویش لەگەڵ خۆی ببات، بەڵام نەک نەیبرد، بەڵکو هەر وەڵامیشی نەدایەوە.

جا کە هەلیکۆپتەرەکە بۆ ئاسمان بەرز بۆوە، ڕەئیس ئەرکانی فەوج هاتە لای ئامیر سریەکەمان وتی: بەخوا ئەگەر دەمانچەم لەلا بوایە، یەک مەخزەن فیشەکم لێی بەتاڵ دەکردو دەمکوشت. ئەو بێ ئابڕووە، ترسنۆکانە تێی تەقاند و ئێمەی بەجێهێشت.

❊❊❊

زۆر ڕۆیشتین، تا گەیشتینە سەر گردێک، کۆمەڵێک کەسمان بەجلی کوردی بینی، لە سەنگەرەکانی ئەوێ چەک و تەقەمەنییان کۆدەکردەوە. سڵاوم لێکردن وتم: ئێوە کێن و چی دەکەن لێرە؟
یەکێکیان وتی: ئێمە پێشمەرگەی تیپی هەشتاو شەشین.
منیش وتم: منیش خزمێکم لەو تیپەیە، ناوی ڕابەری سەید برایمە.
کە ئەمەم وت، هەر هەموویان بە دەنگی بەرز وتیان (اللە اکبر).
سەرم سوڕما وتم: ئەوە بۆچی دەڵێن (اللە اکبر) مەبەستتان چییە؟
یەکێکیان وتی: بەڕاستی ئێمە جاشین، نەک پێشمەرگە. لەو حکومەتە دڕندەیە هەڵگەڕاوینەتەوە.
منیش وتم: زۆر باشە، ئەگەر قبوڵمان بکەن، ئێمەش لەگەڵ ئێوە شەڕ دەکەین و ناوچەکانی تریش ئازاد دەکەین.
وتی: ئێوە زۆر ماندوو دیارن، تاقەتی شەڕکردنتان نەماوە، تەنها ئەو چەکانەی لەلاتانە، بماندەنێ و خواتان لەگەڵ.
ئیتر ئەوەبوو، من و ئەو دوو سەربازەی لەگەڵم بوون، چەکەکانمان دایە ئەوان، وتمان: ئێمە هیچ شارەزای ئەو ناوچەیە نین، دەتوانن ڕێگایەکی نزیکمان پیشان بدەن تاکو بۆی بچین.
یەکێکیان وتی: لەو گردە بڕۆنە خوارەوە، بۆهیچ لایەک لانەدەن، دوای یەک دوو کیلۆمەتر، گوندێکی بچووکی ئێرانتان دێتە پێش، دەتوانن لەوێ پشوویێک بدەن، تاکو هێزتان دێتەوەبەر.
ماوەیەک ڕۆیشتین تا گەیشتینە گوندەکە، لە پشت حاجی

ئۆمەران لە نزیک خانێ لەناو خاکی ئێران بوو.
چووینەماڵێک گەنمەکوتا و مەرەگەی کودووی زەردیان هەبوو.
پێشوازییێکی گەرموگوڕیان لێکردین و خواردنیان لەبەردەم دانایـن.
زۆر برسیمان بوو، دوو ڕۆژ بوو هیچمان نەخواردبوو، لەبرسان
قاپەکەشمان لێستەوە. زۆپایەکی داریان داگیرساندبوو، لەنزیک
زۆپاکە جێگایان بۆ ڕاخستین. ئەو جلە تەڕانەی لەبەرماندا
بوون لە تینی گەرمایەکە وشک بوونەوە. ژنی خاوەن ماڵەکە،
تەماشای ئێمەی دەکرد و دەگریا.
منیش وتم: پوورێ لەبەر چی تۆ دەگرییێ؟
وتی: ڕۆڵەکانم منیش کوڕێکی جوان و جاحێڵی وەکو تۆم
هەبوو، لە شەڕی عێراق و ئێران ونبووە، دەڵێم خوابکات
ئەویش مابێت، وەکو ئێوە سەری خۆی بە ماڵێکدا کردبێت و
ئێستا لەژیاندامابێت.
کە ئەمەم گوێ لێ بوو، گریانم بۆی هات. یەکێک لەو
سەربازانەی کە لەگەڵمدابوو، عەرەب بوو، زۆر ترسا، وتی:
ئێمە دیلین، دەمانکوژن و دەماندەنە دەست سوپای پاسداران.
منیش وتم: مەترسە، ئێمە بە ویست و ئارەزووی خۆمان
هاتووینەتە ئێرە، ئەوان چۆن ئەو کارە خراپەمان لەگەڵ
دەکەن.
دوایی کە تێر نانمان خوارد، چایەیان بۆ لێنایـن و هەریەکی
چەند چایەکی شیرینیشمان خواردەوە. تەماشایەکی سەربازە
عەرەبەکەم کرد و پێی پێکەنیم.
پیاوی خاوەن ماڵەکە سەری سوڕما، وتی: ئەوە تۆ بەچی
پێدەکەنیت؟
وتم: بە ئەبو سەحەر پێدەکەنم، پێش ئەوەی بگەینە ئێرە،
ئەو لەبرسان دەیوت (زۆرم برسییە، هەرکەسێک تێرم بکات،

ئینجا بشمکوژێت، قەیناکات) کەچی ئێستا ئەو هەموو خواردنەی لەپێشەو نایخوات.
کە ئەمەم وت، خاوەن ماڵەکە دەستی لە ملی کرد و نیوچەوانی ماچکرد، دڵی دایەوە و پێی وت: ئێوە میوانی ئێمەن، شەرەفێکی گەورەیە بۆ ئێمە، کە خوا ئێوەی بۆ لای ئێمە ناردووە، من وەکو کوڕی خۆم تەماشاتان دەکەم، چۆن دڵم دێ ئازارتان بدەم.
بەم شێوەیە ئەو شەوەمان لە ماڵی ئەو خانەوادە ئێرانییە بەسەربرد، بەیانیش دوای نانخواردن، خۆمان توند کردەوە و بەرەو چۆمان بەڕێکەوتین. نزیکی نیوەڕۆ گەیشتینە ئەوێ.
کە چووینە بارەگای فیرقە، تاک تاکە سەرباز لەوێ مابوون. لە بێ دەسەڵاتییان لەوێ مابوونەوە. هەندێکیش ملی ڕێگایان گرتبووە بەر بەرەو شارۆچکەی دیانا دەڕۆیشتن. ئێمەش بەردەوام بووین لە ڕۆیشتن، تا گەیشتینە ئەوێ.
لە دیانا تووشی ملازمی ئەوەل عەلی ئامیر سریەکەمان بوومەوە، پێمووت: گەورەم چۆنی؟
وتی: بەخوای ئەو زمانەی تۆ سەری من دەخوات. ئەی پێم نەوتی هیچی تر پێم مەڵێ (گەورەم)؟ پێم بڵێ گەواد، بڵێ سەگباب، تەنیا پێم مەڵێ (گەورەم).
ئەمەی وت، دوایی پۆستاڵەکەی لە پێی داکەند وتی: با پۆستاڵەکانمان بگۆڕینەوە.
منیش وتم: پۆستاڵەکانی من پڕی قوڕ بوونە، بۆ تۆ دەست نادەن.
وتی: قەیناکات من ڕازیم، تۆ پۆستاڵەکانی من لەپێت بکە، منیش ئەوانی تۆ لەپێم دەکەم. تۆ خەڵکی ئێرەیت، هیچ کێشەت نییە، دەتوانی خۆت ڕزگار بکەیت، بەڵام کەسێک

ئـەوە لەپێـی مـن ببینێـت، دەزانـێ کـە مـن ئەفسـەرم، لەوانەیـە ئـازارم بـدات.
منیـش پۆسـتاڵەکەی خـۆم داکەنـد و پۆسـتاڵی ئەویشـم لەپێمکـرد. دوایـی یەکتریمـان بەجێهێشـت. مـن و نائیـب زابـت ئەبـو سـەحەر و سـەربازەکەی تـر کـە لەگەڵـم بـوو، بەیەکـەوە ڕۆیشـتین. لـە ڕێـگا هـەر مەفرەزەیەکـی جـاش و پێشـمەرگە تووشـمان دەبـوون، ڕایـان دەگرتیـن و داوای دەمانچەیـان لێدەکـردم. منیـش هـەر پێـم دەکـرا سـوێندیان بـۆ بخـۆم و بڵێـم هیـچ دەمانچـەم لـەلا نییـە. چونکـە ڕەنگـی پۆسـتاڵەکەم سـوور بـوو، بۆیـە بـە ئەفسـەر تێـم گەیشـتبوون.
بەهەرحـاڵ، لەوێـش بەڕێکەوتیـن و سـواری ئۆتومبێلێـک بوویـن، وتـی تاکـو باتـاس لەگـەڵ خـۆم دەتانبـەم. وتمـان: ئەوەنـدەش هـەر باشـە.
ئێمـەی لـە باتـاس دانـا، ئەفسـەر و سـەربازێکی زۆری لێبـوو، هـەر هەموویـان ڕوویـان لـە ماڵـی محەمـەدی قـادر ئاغـای سـورچی کردبـوو. ئێمـەش لەگـەڵ ئـەوان چووینـە ئـەوێ. بـە هـەزاران سـەرباز و ئەفسـەری لێبـوو. نانـی ئێوارەمـان لەماڵـی ئـەوان خـوارد. شـەویش جێگایـان بـۆ ڕاخسـتین و لـەوێ خەوتیـن.
بەیانـی کـە لـە خـەو هەسـتاینەوە، نانێکـی باشـیان داینـێ و بەڕێـزەوە بەڕێیـان کردیـن. ئێمـەش ملـی ڕێگامـان گرتەبـەر و بـە پێیـان بـەرەو شـەقلاوە کەوتینـە ڕێ، لەڕێـگا هیـچ سـەیارەیەک بـۆی ڕانەگرتیـن.
کـە گەیشـتینە شـەقلاوە، تـازە ئـەوێ ئـازاد کرابـوو، خەڵکەکـەی لەسـەر شـەقامەکان نانیـان دانابـوو، دەیانـدا ئـەو سـەرباز و ئەفسـەرانەی سـوپای عێراقـی کـە ڕایانکردبـوو. ئێمـەش هـەر بـەردەوام بوویـن لـە ڕۆیشـتن و نـاوە نـاوە گوێمـان لـە دەنگـی

تەقـەی تفەنگیـش دەبـوو، نەمانزانـی چییـەو چـی لـەو شـارە دەگـوزەرێ.
لەنـاو بـازاڕی شـەقلاوە، سـەلامی کـوڕی حەسـەن ناسـرم بینـی، پێشـتر ئـەوم دەناسـی، نانێکـی زۆری لەلابـوو، دەیدایـە ئـەو خەڵکـەی کـە ڕایانکردبـوو. سـڵاوی لێکـردم و خواردنێکـی باشـی داینـێ. دوایـی وتـی: جـارێ شـاری هەولێـر ئـازاد نەکـراوە، بۆچـی ئەمشـەو لـەلای ئێمـە نامێننـەوە؟
وتم: نا دەچینەوە، ئێستا ماڵی ئێمەش خەمی ئێمەیانە.
ئەوەبـوو سـواری لۆرییێکـی سـەلاحەددین بوویـن، شـوفێرەکە وتـی: تەنهـا تاکـو هاوینەهـەواری پیرمـام دەتانبـەم.
منیـش وتـم: تاکـو ئەوێـش بمانبەیـت هـەر باشـە. لـە پیرمامیـش بـە ئۆتۆمبێلێکـی تـر خۆمـان گەیانـدە لای بازگـەی شـاری هەولێـر. لەوێشـەوە بـە پێیـان بـەرەو گەڕەکـی موفتـی بەڕێکەوتیـن. کـە گەیشـتینە ماڵـەوە، باوکـم کـە چـاوی پێـم کـەوت وتـی: کەمێکـە شـاری هەولێریـش ئازادکـراوە. بەخێرایـی ئاوێکـم بـە دەموچـاوم داکـرد و جلـە سـەربازیەکانم داکەنـد و جلـی کوردیـم لەبەرکـرد، خـۆم گەیانـدە سـەربازگەی هەولێـر و چەکێکـی کلاشـینکۆفم لەگـەڵ خـۆم هێنـا و هاتمـەوە.
تاکـو گەڕامـەوە ماڵـێ، باوکـم گەرماوەکـەی بـۆ نائیـب زابـت عەبـد و خودێـدە گـەرم کردبـوو، ئەوانیـش خۆیـان شوشـتبوو. دایکیشـم بـۆ ئێـوارە یـەک مەنجـەڵ دۆڵمـەی بـۆ لێنابوویـن. نانەکەمانخـوارد، لەبـەر ماندووبوونـی ڕێـگا، مـن و ئـەو دوو کەسـەی لەگەڵـم بـوون، هـەر زوو خەومـان لێکـەوت.
بەیانـی کـە لەخـەو هەسـتاینەوە، نانـی بەیانیمـان خـوارد، دایکـم یـەک مەنجـەڵ برنجـی سـووری لێنابـوو، پێـی وتـم: بـەو دوو برادەرانـەت بڵـێ (ئێمـە لـە ترسـی حکومـەت لەوانەیـە ڕابکەیـن و

ئێره بەجێ بهێڵین، با ئەوان ئەو مەنجەڵە برنجە لەگەڵ خۆیان ببەن و بچنە مزگەوتی قادر بلە، ئەو سەربازانەی ڕاپانکردووە، هەموویان لەوێنە، بۆ ئەوان باشترە لەوێ بن).
منیش قسەکانی دایکم بە نائیب زابت عەبد و خودێدە وت، ئەوانیش بیرۆکەکەیان زۆر پێ باش بوو، مەنجەڵە برنجەکم دانێ و لەگەڵیان ڕۆیشتم تا ئەوانم گەیاندە مزگەوتی قادر بلە.
ئەفسەر و پلەدار و سەربازێکی زۆر لەناو مزگەوتەکە بوون، خەڵکی شاری هەولێر خواردن و خواردنەوە و بەتانی و جل و بەرگی بۆ هێنابوون.
یەکتریمان ماچکرد و ماڵئاواییمان لە یەکتری کرد. منیش بەرەو ماڵی خۆمان گەڕامەوە، هەرچەند تاکو ئێستاش بە فەرمی تەسریح نەبوومە، بەڵام بە هەرەسهێنانی سوپای عێراقی و ئازادکردنی شار و شارۆچکەکانی کوردستان بەیەکجاری لە سەربازی ڕزگارم بوو.

ڕۆمان

# بیرەوەریی جەنگاوەرێک

کەمال سەعدی

هەولێر ٢٠١٨





چاپخانەی ڕۆشنبیری

چاپکراوەکانی نووسەر:

- شەش کورتەچیرۆکی کوردی هاوبەش لەگەڵ سابیر ڕەشید.
- ونبوون - کۆچیرۆک.
- دەرگا - کۆچیرۆک.
- سەعید زەبۆکی لای خۆمان - ڕۆمان.
- ترحێو - کۆچیرۆک.
- فەنتازیا - کۆچیرۆک.
- چەند وێستگەیەک: ژیان و بیرەوەری.
- هاوسەرگیری و جیابوونەوە.
- مەملەکەتی ڕۆبۆتەکان - ڕۆمان.
- بیرەوەری جەنگاوەرێک - ڕۆمان.

٣٠٠٠دینار